# فەرهەنگی دوانەی

# ئۆکسفۆرد

ئینگلیزی - کوردی

کوردی- ئینگلیزی

سەلام ناوخۆش

پێداچوونەوەی

محمد هەریری

زانکۆی وێست مینستەر / بەریتانیا

فەرهەنگی

ئۆکسفۆردی نوێ

نووسینی

سەلام ناوخۆش

نەخشەسازی و کاری کۆمپیوتەری

ئامانج عبدالکریم

نەخشەسازی بەرگ

سلێمان شێخۆ      ئامانج عبدالکریم

ساڵ و ژمارەی چاپ

٢٠٠٦ - چاپی سێهەم

چاپکردنی

چاپخانەی رۆشنبیری- هەولێر

تیراژ

٢٠٠٠ دانــــە

ژمارەی سپاردن ١٤٨

ساڵی ٢٠٠٦

# فەرهەنگی
# ئۆکسفۆردی نوێ

## فەرهەنگێکی کوردی-ئینگلیزییە
## سۆرانی بادینی ئینگلیزی

نووسینی
سەلام ناوخۆش

چاپی سێهەم
کوردستان ٢٠٠٦

ت

# ناوەڕۆك

## بەنـــاوی خـــوای گـــــەورە

فەرهەنگنووسـی دیاردەیـەکی شارسـتانی‌یە و زۆربـەی گـەلان فەرهـەنگی تایبـەت بـە زمـانی خۆیـان هـەبووە و هەیـە، بوونـی فەرهـەنگیٚ تایبـەت بـە زمانێکـەوە، ئاخاوتنکـاران و کەسانی رەسـەنی ئـەم زمانـە لـە یـەکتر نزیکـتر دەکاتەوە، بەدەگمەن هەڵدەکەویٚ زمانێکی زیندو هەر تەنها زارێك یاخود شێوە زارێك لـەخۆ بگـریٚ، بـەڵکو دیـاردەی هـەبوونی زار و شـێوە زار لـە زمـاندا دیاردەیەکی جیهانی و گشتی‌یە.

زمـانێکی وەك عـەرەبی چـەندەها زار و شـێوە زاری هەیـە هـەروەها زمـانی ئینگلیزی، بەڵان عەرەب و ئینگلیز هەریەکە هەوڵی داوە زمانێکی ستاندەرد بۆ خۆی پەیرەو بکا و هەموو عەرەب و ئینگلیز تا رادەیەك لەسەر شێوە زارێك رێك بکەون و زمانی ستاندەردی خۆیان نەك هەر بۆخۆیان بەڵکو بۆ غەیرە خۆیشیان فەراهەم بێنن، هەریەك لەم دوو زمانە کە ئەمڕۆ دوو زمانی جیهانین و فەرهەنگی ستاندەردی تایبـەت بەخۆیان هەیە، هـەروەها چەندەها فەرهـەنگیش لـە بـواری زمانی slang و colloquial و idiom هەن، ئەم جۆرە زمانانەش هەر لە راژەی زمانی یەککگرتوو دان.

لـەناو کوردانیـش زۆرێـك لـە رۆشـنبیر و توێژەرانـی کـورد خـەریکی کـاری فەرهەنگنووسـی بوونـە، ئـەوەی زانـراوە ئەحمـەدی خـانی یەکـەم فەرهـەنگی کوردی بەناوی "نوبەهارا بچوکان"ی نووسیوە، هەروەها لەپاشان کەسانی وەك یوسـف پاشـای خـالدی و گیـوی موکریـانی و موحەمـەد خـاڵ و مـەردۆخی و جگەرخوێن و توفیق وەهبی و شەفیق قەزاز و ئیدی.

بەحوکمی ئەوەی کوردستان وڵاتێکی داگیرکراو بووە زمانی کوردی شەش

بڕی سەرەکی لەخۆ گرتووە کە ئەویش: کرمانجی خواروو، کرمانجی سەرو، گۆران و لوڕ و لەك و زازایە.

لەناو هەریەك لەم زارانەدا چەندەها شێوەزار هەیە هەریەکەو وشە و پەیڤی تایبەت بەخۆی هەیە، فەرهەنگنووسانی کورد هەریەکێ بەگوێرەی شیانی خۆی هەوڵیداوە وشەکانی زارەکەی یاخود زیاتر لە زارێکی کوردی لە فەرهەنگێکدا کۆ بکاتەوە بەڵکو ئەم کارەی ببێتە هەنگاوێك بۆ ئەوەی هەم ئەم وشانە لە فەوتان لەسەردەمی داگیرکردن رزگاری ببێ هەروەها بۆ ئەوەی رۆشنبیرانی کورد لەسەر بونیادی زمانێکی یەکگرتوودا کۆك بن، بەڵام خەونی ئەو فەرهەنگ نووسانە لەسەر ئاستی کوردستانی گەورەدا نەهاتۆتە دی، چونکە هێشتا سێبەشی کوردستان لە حاڵەتی داگیرکردن دەژی، لەبەشە باشووری کوردستاندا، کە سێ بەش لە پاش سەرهەڵدانی بەهاری ١٩٩١ دەسەلاتێکی کوردی بەرێوەی دەبات دەرفەتێك هاتۆتە ئاراوە بیر لە زمانێکی یەکگرتوو بکرێتەوە.

لەوانەیە هەندێك بڵێن زمانێکی یەکگرتوو لە باشور هەیە، بەڵام ئەوەی پێی دەوترێ زمانی یەکگرتوو زیاتر لە شێوە زاری سلێمانی وەرگیراوە و تاڕادەیەك دەسەلاتی بەسەر شێوازی نووسینی بەشە کرمانجی خواروودا پەیداکردووە.

بەڵام نووسەرانی هەرسێ شاری کەرکوك، سلێمانی، هەولێر تەواو دەرکیان بەوە کردووە کە ئەمە دیاردەیەکی زۆر ساخلەم و تەندروست نیە، بۆیە لە کەرکوك و هەولێر (بەتایبەتی هەولێر بەحوکمی ئەوەی دوای راپەرین بۆتە ناوەندێکی رۆشنبیری و سیاسی) رۆشنبیران پەیڤی تایبەت بە شار و دێهاتەکانی خۆیان بەکاردێنن، هەرچی دەڤەری بادینانە ئەوا هیچ لەم زمانە یەکگرتووە ناگات هەروەها دەڤەری سۆران و گەرمیان و بابانیش زۆر لە پەیڤەکانی دەڤەری بادینان ناگەن!

لە هەشتەکان بۆ ئەوەی دیاردەی سۆرانی (کرمانجی خواروو) بادینی

(بەشێك لە كرمانجی سەرو) زیاتر لەیەكتر جودا بن، رژێمی عێراق رۆژنامەی (ئاسۆ)ی بەشێوەی سۆرانی و (بزاڤ)ی بەبادینی لە بەغدا دەردەكرد، لەسەردەمی دەسەلاتی كوردیش (١٩٩١-؟) لە پاش ١٩٩٤-ەوە، دەسەلاتی كورد بەشی باشوری كردە دوو دەڤەری لەیەك جیا، مانەوەی ئەو حالەتە تاكو ٢٠٠٣، پرۆسەی زمانی یەككرتووی زۆر دواتر ئێخست!!

نووسەری ئەم فەرهەنگە بچووكە لەساڵی ١٩٩٩ لە ژمارە (١٩) رۆژنامەی پەیمان كورتە وتارێكی بەناوی (سۆرمانجی دەستپێكەك بۆ زمانێ كوردیێ هەڤگرتی) بلاو كردەوە بەشێوەیەكی تیۆری بانگاشەی ئەوەی كرد كە هەوڵبدرێ بە "سورمانجی" سۆرانی-كرمانجی- بدوێین، بنووسین، لەساڵی ٢٠٠٢ یش كە فەرهەنگی ئۆكسفۆردی دەركرد لەزۆر شوێن وشەی بادینی لەگەلْ وشەی سۆرانی لەبەرامبەر پەیڤی ئینگلیزی بەكارهێنا، ئەمساڵیش لەهەوڵێكی تردا فەرهەنگی ئۆكسفۆردی نوێ كە فەرهەنگێكی كوردی-ئینگلیزی‌یە لەبەشە كوردیەكەدا ستونێك زاراوەی سۆرانی لە بەرامبەری بادینی بەكارهێناوە، بەلام بەراشكاوی دەڵێم ئەو هەولانەی من هیچ كاریگەریەكی ئەو تۆی نابێ ئەگەر دەسەلاتی كوردی بەبریارێكی "كوردانە" كتێبە مەنهەجیەكانی قوتابخانە و دام و دەزگای دەولەت بەو دوو زاراوە بلاو نەكاتەوە؟!!

# ئەلف بای کوردی

لە نێو کوردان دا سێ جۆری ڕێنووس هەن: ڕێنووسی سلاڤی کوردەکانی سۆڤیەتی پێشوو پێی ئەنووسن؛ ڕێنووسی پیتی لاتینی کوردەکانی باکور و ڕۆژئاوا و بەشێك لە باشور بەکاری دەهێنن، ڕێنووسی پیتی عەرەبی کوردەکانی باشور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەکاری دەهێنن، ئەم سێ جۆر ڕێنووسە هیچیان لە ڕەسەندا کوردی نین؛ بەڵکو لەسەر ڕێنووسی پیتی گەلانی دراوسێی کورد دارێژراون، هەریەك لەم ڕێنووسانەش کەم و کورتی خۆیان هەیە، فەرهەنگە کوردیەکانیش ئەوانەی من دیومن- بەپێی ڕێنووسی پیتی لاتینی یاخود عەرەبی نوسراون، تۆفیق وەهبی بەهاوبەش لەگەڵ ئیدمۆندز لەساڵی ١٩٦٦ دا فەرهەنگێکی کوردی-ئینگلیزیان بەپێی پیتی لاتینی (یاخود ئینگلیزی) نووسیوە.

بەگوێرەی ئەوان بەلف بای کوردی سی و یەك پیت لەخۆ دەگرێ، لەساڵی ١٩٩٢ باران ڕزگار فەرهەنگێکی کوردی ئینگلیزی، ئینگلیزی کوردی بڵاوکردۆتەوە، ئەویش لە لاپەڕە (٤-٥) ئەلف بای کوردی بە (٣١) پیت داناوە، هەروەها ئارماندبل فەرهەنگێکی کوردی-ئینگلیزی تورکی فەرەنسی بڵاوکردۆتەوە ژمارەی پیتەکانی کوردی بە (٣١) پیت داناوە، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تر ئەو سێ فەرهەنگە ئەلف بای کوردی‌یان بەشێوەی ئەلف بای ئینگلیزی ڕیزکردووە و ئەو پیتانەی کە لە ئینگلیزی نین لە کوردی دا هەن بەگوێرەی نزیکی پیتەکە لە پیتە هاوسێ‌کەی ڕیز کردووە بەم شێوەیە:

a b c d e e f g h h̲ I j k (k̲) l m n o p q r r̲ s Ş t (t̲)u v w x x̲ y z

لەم شێوە ڕێنووسەدا، بزوێن و نەبزوێن تێکەڵ یەك کراون هەروەها مەرج نیە ئەم هەموو پیتە هەر هەمووی لەبەرایی وشەی کوردی بێن، بۆیە خوێنەر چۆن دەتوانێ لە وشەیەك بۆ نموونە کەبە (I-ڕ) ڕێی لاواز- دەست پێ بکات کە لەڕەسەندا لە کوردی وشە نیە بە (ڕ) دەست پێ بکات هەروەها ئەوەی تەواو شەهرەزای ئەلف بای

ئینگلیزی نەبێ ناتوانێ بە ئاسانی ئەو وشەیە بدۆزێتەوە کە گەرەکیەتی، لەسەر ئەلف بای لاتینی زێتر ناڕۆین چونکە ئەم فەرهەنگەی ئێمەبەپێی ئەلف بای عەرەبییە.

لە فەرهەنگی المورد عەرەبی ئینگلیزی، روحی البعلبکی لە لاپەڕە (١٧) ئەلف بای عەرەبی بەم شێوەیە ریزکردووە:

ا ب ت ث ج ح خ د ذ ر ز س ش ص ض ط ظ ع غ ف ق ك ل م ن ه و ى.

هەر فەرهەنگێکی کوردی کە بە ئەلف بای عەرەبی نوسرابێ، ئەوا بەپێگری کردن بە ئەدگار و تایبەتیەکانی زمانی کوردی ئەو ئەلف با عەرەبییەی بۆ خۆی کردۆتە بنەمایەك، بەڵام هەر هەموویان لەسەر ژمارەی پیتەکانی کوردی کۆك نین، موحەمەد خاڵی راڤەڤانی قورئانی پیرۆز، فەرهەنگێکی سێ بەرگی قەبارە گەورەی نووسیوە، لە جزمی یەکەمی فەرهەنگەکەدا دەنووسێ: "زمانی کوردی (٢٧) پیتی هەیە" و ئەلف با کەشی بەم شێوەیە ریزکردووە:

ا ب پ ج چ ح خ د ر ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ك گ ل م ن و ه ى هەروەها لە ریزکردنی پیتەکانیش هەموو فەرهەنگە کوردیەکان (و) وەپێش (ه) دێخن، رێزدار فاضل نیزامەدین لەلاپەڕە (٧)ی چاپی دووەمی "ئەستێرە گەشە"دا پیتەکانی کوردی ئاوا رێز دەکات:

ا ب پ ت ج چ (ح) خ د ر ز ژ س ش (ع) (غ) ف ڤ (ق) ك گ ل م ن و ه ى.

لە پەراوێزی لاپەڕە هەشتدا کاك فاضل بەدوور دەزانێ کە هەر چوار پیتی (ح ع غ ق) کوردی بن، بەڵکو هاتونەتە ناو زمانی کوردی، لەو روانگەوە، لە نەزەری کاك فاضل دا کورد (٢٣) پیتی هەیە، ئەو پیتانەش بێجگە لە پیتی (ڤ) لە کرمانجی خواروودا هەموو لە سەرەتای وشە دێن، بەڵام هەرچی (ڤ) ئەوا زیاتر لە وشەکانی کرمانجی سەرودا لە سەرەتای وشە دێت.

مامۆستا هەژار موکریانی لە نووسینی فەرهەنگی هەنبانە بۆرینەدا سودی وەك سەرچاوەیەك لە "ئەستێرە گەشە" بینیوە بەڵام ژمارەی پیتەکانی زمانی کوردی دەکاتە (٣١):

هەمزە بێ پێ تێ جیم چێ حێ خێ دال رێ رێ‌بزرگ زێ ژێ سین شین عین غین فێ ڤێ قاف کاف گاف لام لام بزرگ میم ن واو واوی مجهول هێ یێ یای مجهول.

لە فەرهەنگی "تاهیر سادق" دا ئەلف بای کوردی بەم شێوەیە هاتووە:

ب ت پ ج ح خ چ د ر ز ژ س ش ف ق ڤ ك گ ل م ن و ه ى.

گیوی موکریانی له فەرهەنگی کوردستاندا ئەلف بای کوردی وا دەبینێ:

ك ب پ ت ج چ ح خ د ر ڕ ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ك گ ل م ن و ه ى.

د.شەفیق قەزازیش لە لاپەڕە (١٧-١٨) ئەلف بای کوردی وا دەنووسێ:

ا هەمزە ب پ ت ج چ ح خ د ر ڕ ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ك گ ل ڵ م ن و ۆ وو ه ە ى ێ ىێ

لەم چەند فەرهەنگەدا، فەرهەنگنووسانی کورد هەر هەموو لەسەر یەك ئەلف با ڕێك نین، مامۆستا فاضل باوەڕی وایە کە هەر چوار پیتی (ح ع غ ق) کوردی نین، گیوی موکریانیش دەنووسێ کە (ع غ) کوردی نین بۆیە لە زۆر شوێن (ح ع) و (خ غ) لە فەرهەنگەکەی تێکەڵکراوە، لە فەرهەنگی "تاهیر سادق"یشدا (ع غ) نەهاتوون، بەڵام موحەمەدی خاڵ و هەژار موکریانی ئەم چوار پیتەیان لە فەرهەنگەکانیاندا بەکارهێناوە، مامۆستا خاڵ لە فەرهەنگەکەی دا لەو چەند لاپەڕەیەدا پەیڤی کوردی بۆ ئەم چوار پیتە هێناوە: (ح-٤٧-٥٦)، (ع ٣٥٧-٣٦١)، (غ ٣٦٢-٣٦٤) (ق ٧-٦٥) مامۆستا هەژاری موکریانیش لەو چەند لاپەڕەیەدا وشەی کوردی بۆ ئەم چوار پیتە هێناوە:

(ح ٢٢٥-٢٣٤)، (ع ٥٠٣-٥٠٩)، (غ ٥١١-٥١٣)، (ق ٥٤١-٥٩٤). لە فەرهەنگی "کوردستان"یش لە لاپەڕە (٣٤١-٣٥٠) وشە بۆ پیتی (ح) هێنراوە، بۆ پیتی (ق) لە (٦٨٢) هەتا (٧٢٧) وشەی بۆ هێنراوە، لە فەرهەنگی شارەزووریش وشە بۆ ئەم چوار پیتە هێنراوە:

(ح ٢١٧-٢٢٢)، (ع ٣٩٠-٣٩٢)، (غ ٣٩٣-٣٩٤) (ق ٤٠٨-٤٣٠).

ئەمەو لە فەرهەنگەکاندا لە هەندێ شوێن بزوێن و نەبزوێن تێکەڵکراون هەروەها هەندێکیان لە ڕیزکردنی پیتەکاندا کۆك نین بۆ نموونە لە فەرهەنگی تاهیر سادق دا (ت) پێش (پ) هاتووە هەروەها (ق) پێش (ڤ) هاتووە.

ئەمەو هەردوو جووتە پیتی (ل،ڵ)، (ر،ڕ) لە کوردیدا جیاواز لە ئینگلیزی فۆنیمن نەك ئەلۆفۆن؛ بۆیە دەبێ لەیەك جیابرکێنەوە، گیوی موکریانی لە لاپەڕە (٨٢٨) هەردوو (ل ڵ) تێکەڵ دەکا و دەنووسێ: (ل) پیتێکی ئابێی کوردییە.

لە موکریاندا لە گەلێك جێگایاندا بە (ڵ) و لە سۆراندا بە (ر) بەکاردەبرێ وەکو

مار، خار: مالْ، خالْ و له  باكوردا به (ل) بەكاردەبرێ. له نووسیندا ئەم دووه لەیەك جیان نەك یەك پیت بن: هەله، هەڵه؛پەله، پەڵە،کەل ، کەڵ زۆر لەیەك جیان.

لەم فەرهەنگەدا ئەم ئەلف بایه پەیڕەو دەکرێ:

ا ب پ ت ج چ ح خ د ر ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ك گ ل م ن و ه ی.

بۆچی ئەم ئەلف بایه؟!

باوەڕم وایه که ئەو چوار پیتەی (ح ع غ ق) له لای هەندێ فەرهەنگ نووس به کوردی نازانرێن هەر چوار کوردین به تایبەتی (ح) و (ق) و (ع) چونکه هەریەکه له چەندەها وشەی کوردی هەن، هەروەها بەسود وەرگرتن له  عەرەبی و تورکی ئەوا (غ) له کوردی ئەمڕۆ دا هەیه.

هەندێ وشەی کوردی ئەمڕۆ بەجۆرێ بوونەته کوردی که هەموو کوردێك لێیان تێ دەگا، هەر بۆ نموونه قەلەم، قوتابی، قەساب، وەخت..هتد، لەم فەرهەنگەدا (لەریزکردندا) ئاماژه به (ڕ) و (ڵ) نەکراوه چونکه ئەوانه له  سەرەتای وشەی کوردی دا ناهێن، ئەمه ئەوه ناگەیەنێ که ئەم دوو پیته کوردی نین، بەڵکو تەنها بۆ کاری فەرهەنگکاری بەکارمان نەهێناون، چونکه لەسەرەتای وشه نایەن، هەروەها هەر چەند (ۆ)، (و)، (وو) له کوردیدا فۆنیمن به واتای مانای وشه دەگۆڕن له هەندێ شوێن وەك  کۆڕ، کوڕ، کووڕ بەڵام سەبارەت به سەرەتای وشه (و) و (وو) واتای  وشه ناگۆڕن بڵێی وشە/ووشه؛ وته/ووته هەر هەمان واته دەبەخشن، بۆیه لەم فەرهەنگەدا تەنها(و) له سەرەتای وشه  باسکراوه، بەڵام له هەندێ وشه (له ناوەڕاست و کۆتایی) (وو) نووسراوه.

پیتی (ڤ) پیتێکی ڕەسەنی کوردی‌یه بەڵام له کرمانجی خواروودا تەنها چەند وشەیەك بەم پیته دەست پێدەکەن، هەرچی هەورامی و باکوری‌یه ئەوا چەندەها وشەیان هەیه که بەم پیته دەست پێدەکەن، ئێمەش تەنها ئەو چەند وشەیەمان هێناوه که له کرمانجی خوارو‌و–سۆرانی دا هەن.

هەروەها سەبارەت بەو فەرهەنگانەی که لەسەر ئەلف  بای لاتینی نووسراون و که وشەیان بەجیا  بۆ (ئه e)، (ئێ  ) (ئۆ–ه) هێناوەتەوه، ئێمه هەموومان لەژێر پیتی (ئا) یاخود (ا) ریز کردوون، چونکه بەرای ئێمه (ئه، ئێ، ئۆ) سێ پیتی لەیەك جیانین.

# بۆچی ئەم فەرھەنگە

فەرھەنگنووسانی کورد وەك بەڕێزان موحەمەدی خاڵ و فاضل نیزامەدین و گیوی موکریانی و هەژاری موکریانی هەریەکە فەرھەنگێکی قەبە و بەنرخیان داناوە بە هەزاران وشەی کوردیان لە فەوتان رزگارکردوە، ئەم فەرھەنگەش ژێدەرەکەی هەر ئەم فەرھەنگانە و ئی ترە..

لەم فەرھەنگانەدا وشە لە زۆربەی زارەکانی کوردیدا هێنراون، بەڵام لەم فەرھەنگەی ئێمەدا وێڕای ئەوەی بەرامبەر هەر وشەیەکی کوردی چەند وشەیەکی ئینگلیزی هێنراوە، ئەوا هەوڵدراوە لە ستونی یەکەم (بەشی سۆرانی) وشە لەهەرسێ شاری هەولێر و کەرکوك و سلێمانی بهێنین و لە بەرامبەر وشەی بادینی دابنێین بۆ ئەوەی سەرەتا بەشی باشور سود لەم ئەزموونە وەربگرێ، سەبارەت بە سۆرانی‌یەکە بەحوکمی ئەوەی نووسەر خەڵکی هەولێرە و ئاگاداری پەیڤەکانی کەرکوك و سلێمانیە، ئاریشەیەکی ئەوتۆی نەهاتۆتە رێ، بەڵام سەبارەت بە پەیڤەکانی بادینی تووشی هەندێ گیروگرفت بووین، هەر چەندە نووسەر ئەوە حەوت ساڵە مامۆستایە لەبەشی ئینگلیزی ئادابی دهۆك، بەڵام بەحوکمی ئەوەی پسپۆرییەکەی لە ئینگلیزیە، تەواو بەسەر بادینی‌یەکە زاڵ نیە، هەروەها ئەگەر لەسەردەمێك کرمانجی سەروو زمانی نووسین بووە و لە قۆناغێکی زێڕین دا ژیاوە بەجۆرێ لە زۆر بواردا نووسەرانی پێشەنگ بوونە وەك لە فەرھەنگ نووسیدا ئەحمەدی خانی بە "نوبەھارا بچوکان" پێشەنگ بووە، لە چیرۆك دا (مەلا مەحمودی بایەزیدی و فۆادی تەمۆ) بە پێشەنگ دێن، لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا رەحمی هەکاری، لە رۆژنامە نووسی‌دا مقداد و جەلادەت بەدرخان، بەڵام لەدوای سەدەی بیستەمەوە بەتایبەتی لەپاش داگیرکردن و دابەشکردنی کوردستاندا، کرمانجی سەروو بەتایبەتی بەشە بادینی‌یەکە و بۆتانی‌یەکە دوچاری هەرەشەی فەوتان بوونەوە، لە دەڤەری بادینان کوردی نووسین بەرەو کزبوونێکی خەتەرناك چوو، ئەوەتا سادقی بەهائەدین کە رێزماننوسێکی دیاری کوردە، کوردی‌یەکەی لە سەرەتا بەهێز نەبووە.

هەروەها نووسەرێکی وەك ئەنوەر موحەمەد تاهیر لەچاوپێکەوتنێکدا دەنووسێ: "دەمێ من دەست دایێ چیرۆکنڤیسینێ ج بەرهەمێن دی یێن کوردی ل پێش من نەبوون، یەعنی من ج بەرهەم ب کورمانجی نەخواندینە " لەپاش ١٩٧٥ هەرەشەی "تەعریب"

بەتەواوی دەڤەرەکەی هەرێسانکردبوو بەجۆرێ چەند نەوەیەکی هەتا دوای ڕاپەڕینیشی پێکەیاند زۆر بێ ئاگابوون لە زمانی کوردی، لەو دەساڵەدا، دەڤەرەکە وا بووژانەوەیەک لە ڕووی زمانەوە بەخۆوە دەبینێ چاوەڕێ دەکرێ لە ڕێی پرۆسەی بەکوردی کردنی مەنهەجی خوێندن نەوەیەکی کوردی زان (بە ئاخاوتن و نووسین) دروست ببێ، نووسەر بۆ ئەوەی فەرهەنگەکەی لە ڕێچکەی ئەکادیمیەت دوور نەکەوێتەوە پرسیاری لە هەموو کوردیزانێکی دەڤەرەکە کردووە، لێرەش هەر تووشی ئاریشە هاتین، چونکە عەشیرەتەکانی ئەو دەڤەرە هەریەکە و پەیڤی تایبەت بەخۆی هەیە و تاڕادەیەک لەیەک جیان، بەڵام ئێمە هەر کۆڵمان نەدا پرسیارمان لە مامۆستا و نووسەر و فەرهەنگنووس و قوتابی و پیرەمێردی دەڤەرەکە کرد تاکو بتوانین تاڕادەیەک فەرهەنگێ بنووسین شایەن بەمتمانەبێ.

لە کۆتایی پێم خۆشە ئەم سێ سرنجە لە بارەی فەرهەنگەکەمەوە بخەمە ڕوو:

یەکەم: ناوی فەرهەنگەکە:فەرهەنگەکەم ناونا بە ئۆکسفۆردی نوێ، چونکە لە ئایندەیەکی نزیکدا خوار یاربێ لەگەڵ فەرهەنگی ئۆکسفۆرد ئینگلیزی-کوردی لەیەک بەرگی قەبارە گەورەدا بڵاوی دەکەمەوە هەروەها فەرهەنگێکی گیرفانیشیان لێ دروست دەکەم.

دووەم: لە هەندێ شوێن هەوڵمان داوە وشەیەکی سۆرمانجی دابنێین، ئەم دیاردەیەش ساخلەم و تەندروست بووە چونکە ئەوەی ئێستا بەتایبەتی قوتابیان زۆربەی هەرە زۆری لە سۆرمانجییەکە دەگات.

سێیەم: نووسەر چاک دەزانێ (سۆرانی) و (بادینی) ئەوەندی پەیوەندییان بە جوگرافیا و سیاسەتەوە هەیە ئەوەندە پەیوەندیان بەزمانەوە نیە، بەڵام ماوەیەکی زۆرە لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان کە دەگوترێ سۆرانی یاخود بادینی تێ دەگەن مەسەلەکە چییە، لەپاش چاپکردنی فەرهەنگی ئۆکسفۆرد ئیمێلێکم لە نووسەرێکی دەرەوە بەناوی Da vid kemp بۆ هاتووە پرسیاری ئەوە دەکات ئاخۆ فەرهەنگەکەم کوردی سۆرانی یە یان نە؟!

لەکۆتایی هیوادارم ئەم فەرهەنگە بچووکەم سەرەتایەک بێ بۆ ئەوەی ڕۆشنبیرانی هەردوو دەڤەر زیاتر ئاگاداری وشە و پەیڤی یەکتر بن.

سەلام ناوخۆش

٢٠٠٢/٥/٢٢

# سەرچاوە

١-ئەنوەر محمد تاهیر و عبدالستار فتاح، فەرهەنگا مامۆستای کوردستان ٢٠٠٠.

٢-جگەر خوێن، فەرهەنگا کوردی، بەرگی یەکەم و دووەم، بەغدا ١٩٦٢.

٣-سەرتیپ قادر و صلاح خۆشناو، نۆسەد وشەی بەسوود. لەندەن ١٩٩٢.

٤-فاضل نیزامەدین، ئەستێرە گەشە، بەغدا ١٩٧٧،١٩٨٩.

٥-گیوی موکریانی، فەرهەنگی کوردستان، هەولێر ١٩٩٩.

٦-موحەمەدی خاڵ، فەرهەنگی خاڵ، ٣ بەرگ، سلێمانی ١٩٦٠-١٩٦٤.

٧-هەژار موکریانی، هەنبانە بۆرینە، تەهران ١٩٩١.

٨-هەژار موکریانی، وەرگێراوی قورئانی پیرۆز بەکوردی، تەهران ١٣٧٩.

-Baalbaki, .1988 Al-mawrid-A modern Arabic English dictionary, Beirut.

-Bakir,s.n. 2002 Oxford, English kurdish Dictionary, Hawler:naza press.

-Qazzaz,sh.2000.The sharezoor,Kurdish English Dictionary. Hawler:Aras press.

-Rizgar,B.1993. Kurdish-English, English-Kursdish dictionary,London

-Saadalla,s. 1998. ________________________________.

-Wahby,T. and Edomnds, c.j 1966. A Kurdish-English dictionary. Oxford:clarendon press.

# سوپاسنامە

سوپاس بۆ خوای گەورە کە زۆر یارمەتی دام ئەم فەرهەنگەش تەواو بکەم.
لە نووسینی ئەم فەرهەنگەدا بەتایبەتی لەبارەی پەیڤی کوردی بادینی، زۆر مامۆستا و فەرهەنگنووس و نوسەر و قوتابی و خەڵکی گوندان یارمەتی زۆریان دام، لەوانەی کە لەبیرمن ماموستا ئەحمەد حەیدەر، فازل حەیدەر، ئەنوەر موحەمەد تاهیر، عەبدولستار فەتاح، عماد وەیسی، بایز عومەر، حەسەن سلێڤانەیی، هەڤال سەلیم، ابوعبید عبداللە، دیار عبدالکریم، قەیدار نەبی، سلێمان اسماعیل،إبراهیم شیلانی، رەشید سەعدی شاهین، هادی عەلی یونس، مستەفا دەرباس، هەروەها زۆر سوپاسی برای هێژا کاک ئامانج عەبدولکەریم دەکەم کەرەنجێکی زۆری کێشا و کاری کۆمپیوتەرەکەی بۆ کردم.
دووبارە سوپاس بۆ هەرکەسێ کەوشەیەکم سود لێ وەرگرتبێ بەتایبەتی کەسانی نادیار کە زۆریان هاندام و یارمەتیان دام، نەک هەر لە کوردییەکە بەڵکو، لە ئینگلیزیەکەش.

سەلام ناوخۆش

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| A The first letter of the kurdish alphabet | ئا | ئا |
| Yes | ئە، بەلێ | ئا |
| Ah! Oh! | ئا، ئای | ئا |
| August | تەباخ | ئاب |
| Reputation, honour | شەرم | ئابروو |
| Sanction, blockade, siege | دورپێچ | ئابلووقە |
| Economic, embargo, economic sanction | دورپێچا ئابوری | ئابلوقەی ئابووری |
| Economy | ئابووری | ئابووری |
| Political economy | ئابورا سیاسی | ئابوری سیاسی |
| Economist | ئابورناس/ ئابورزان | ئابوریزان/ ئابوریناس |
| Economics | زانستێ ئابورێ | ئابوریزانی |
| Subscription | ئابونە | ئابوونە |
| Sigh | ئاخ | ئاخ/ هەناسە |
| Talk-discourse, utterance | ئاخفتن | ئاخاوتن |
| Trough, (manger) | هافر | ئاخوڕ |
| Stable | ستەبل | ئاخوڕ/ تەویلە |
| Direction, guidance | سەمت | ئاراستە |
| Tranquillity, patience | هەدار/ حەویان | ئارام |
| Make up, adornment | خەملاندن | ئارایش |
| Flour | ئار | ئارد |
| Cucumber | خیار | ئاروو |
| Desire, lust | حەز/ ڤیان | ئارەزوو |
| Sweat | خوە | ئارەق |
| Wine, alcohol | ئارەق | ئارەق |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Drunkard, addict | ئارەقڤەخور | ئارەقخۆر |
| Brave, bold | زیرەک/ پەیت/ بجەرگ | ئازا |
| Free, independent | ئازا / سەربخۆ | ئازاد |
| Liberty, freedom | ئازادی/ سەربخوەیی | ئازادی، سەربەستی |
| Freedom of assembly | ئازادیا کۆمبونێ | ئازادی کۆبونەوە |
| Freedom of choice | ئازادیا هەلبژارتنێ | ئازادی هەڵبژاردن |
| Freedom of seas | ئازادیا دەریای | ئازادی دەریایی |
| Freedom of trade | ئازادیا بازرگانی | ئازادی بازرگانی |
| Freedom of speech, opinion | ئازادیا بیروڕایا | ئازادی ڕادەربڕین/ بیرورا |
| Freedom of movement, travel | ئازادیا گەشت کرن | ئازادی گەشت کردن |
| Freedom of religion | ئازادیا ئولی/ دینی | ئازادی ئایینی |
| Political liberty | ئازادیا سیاسی | ئازادی سیاسی |
| Personal liberty | ئازادیا کەسی | ئازادی کەسی |
| Freedom of press | ئازادیا روژنامەڤانی | ئازادی ڕۆژنامەگەری |
| Freedom of worship | ئازادیا پەرستنێ | ئازادی پەرستن |
| Freedom of thought | ئازادیا هزرێ | ئازادی بیر |
| Ache, agony | ئێش | ئازار |
| March | ئادار | ئازار |
| Supplies, provisions | ئەرزاق/ متا | ئازوخە/ ئازووقە |
| Livestock | تەرش/ کەوال | ئاژاڵ/ ئاژەڵ |
| Zoology | زانستێ کەوالی | ئاژاڵزانی |
| Agency | ئەجانس | ئاژانس |
| Disturbance, chaos | شەپرزە/ گرفتاری | ئاژاوە |
| Agitator, troublesome | شەڕوکە | ئاژاوەچی |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| To drive | هاژوتن | ئاژووتن |
| To lead | هاژووتن | ئاژووتن |
| Easy, simple | ساناهی | ئاسان |
| Security | تەناهی/ تەنایی | ئاسایش |
| Security council | جڤاتا تەنایێ | ئەنجومەنی ئاسایش |
| Ordinary, usual, customary | ئاسایی | ئاسایی |
| Ancient, antique | کەڤن | ئاسایی/ کۆن |
| Level, standard | لوک/ ئاست | ئاست |
| Trifle | بزەحمەت | ئاستەم |
| Obstacle | ئاستەنگ | ئاستەنگ |
| Deer, gazelle | خەزال | ئاسك/ مامز |
| Sky, heaven | ئەسمان/ عەسمان | ئاسمان |
| Divine | ئەسمانی/یەزدانی | ئاسمانی |
| Sky-blue | شینێ عەسمانی | ئاسمانی (رەنگ) |
| Abstract | ئەسمانی | ئاسمانی |
| Iron | ئاسن | ئاسن |
| Blacksmith | ئاسنگەر | ئاسنگەر |
| Horizon | ئاسۆ | ئاسۆ |
| Horizontal | ئاسۆیی | ئاسۆیی |
| Peaceful, happy | دلخۆش/ کەیفخوەش/ بکەیف | ئاسوودە |
| Happiness | کەیفخوەشی | ئاسوودەیی |
| Asia | ئاسیا | ئاسیا |
| Asia minor | ئاسیا بچیکێ | ئاسیای بچووک |
| Mill | ئاش | ئاش |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Meal, food | ئاش | ئاش |
| Tax of mill | هەقێ ئاشی | ئاشانە |
| Quit, give up doing | بەسکرن | ئاشبەتاڵ |
| Reconciliation | ئاشتبون | ئاشت بوونەوە |
| Peace | ئاشتی | ئاشتی |
| Obvious | خوەیا/ دیار | ئاشکرا |
| Appearance, uncoverness | ئەشکرابوون | ئاشکرابوون |
| To reveal, declare | ئەشکراکرن | ئاشکراکردن |
| Mill operator, miller | ئاشەڤان | ئاشگێڕ/ ئاشەوان |
| Acquaintance | نیاس/ ئاشینا | ئاشنا |
| Acquaitanceship | نیاسی | ئاشنایەتی |
| Friends and acquaintance | هەڤال و نیاس | ئاشنا ورۆشنا |
| Disturbance, sedition, riot, unrest | ئاشوب/ فیتنە | ئاشووب |
| Miller | ئاشڤان | ئاشەوان |
| Millery | ئاشڤانی | ئاشەوانی |
| Water mill | ئاشێ ئاڤێ | ئاشی ئاو |
| Coffee grinder | ئاشێ قەهوێ | ئاشی قاوەی |
| Air mill, wind mill | ئاشێ بایێ | ئاشی با |
| Lover | ئاشق | ئاشق |
| Creation, origination, formation, Molding | چێکرن/ ئافراندن | ئافراندن |
| Woman | ژنک | ئافرەت |
| Bravo, excellent, excellence | هەرەباش/ عافەرین | ئافەرین |
| To praise | مەدح | ئافەرین |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Direction, trend | ئاقار | ئاقار |
| Orchard, open field | ئاقار | ئاقار |
| Moral, conduct | رەوشت/ سنج | ئاکار |
| Ethics, moral philosophy | رەوشتناسی | ئاکارناسی |
| Result, outcome, consequence | ئەنجام | ئاکام |
| Sober | ئاگەهدار | ئاگادار |
| Conscious, aware | ئاگەهدار / هشیار | ئاگادار/ وشیار |
| Informer, informant | ئاگەهکەر | ئاگادارکەر |
| Intelligence, consciousness | هشیاری | ئاگایی |
| Class consciousness | هشیاری چینایەتی | ئاگایی چینایەتی |
| Fire | ئاگر | ئاگر |
| Bombardment | ئاگرباران | ئاگرباران |
| Play with fire, fireworks | ئاگربازی | ئاگربازی |
| Cease fire, armistice | ئاگربەست | ئاگربەست |
| Fire place, hearth | کوچک، ئاگردانک | ئاگردان |
| Inflammable | ئاگرگر | ئاگرگر |
| Fire extinguishing, toquench | ئاگر ڤەمراندن | ئاگر کوژاندنەوە |
| Volcano | ئاگر پژێن | ئاگر پژێن |
| Fire worshipper | ئاگرپارێز/ ئاگر پەرست | ئاگر پەرست |
| Fire fighter | ئاگر کوژ | ئاگر کوژێنەوە |
| Scarlet red, bright | سوری ڤەبی | ئاڵ |
| Banner, flag | ئال/ ئالا | ئاڵا |

| English | بادینی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| Gold | زێر | ئاڵتوون |
| Grazing, grass, fodder | ئالف | ئالف |
| Complex, complicated | ئالوز/ ئاسێ | ئاڵۆز |
| Exchange | ئالوگۆر/ گۆهرین/ ڤەگوهارتن | ئاڵوگۆڕ |
| Barter, trade, trade-off | پەڤ گوهەرین/ ب تشتەکی گۆهەرین | ئالوگۆڕ |
| Tonsil, gland | ئالور هێستل/ گلالە/ بەیڤۆک | ئاڵوو |
| Burdened, longing | ئەشق | ئالوودە |
| Fodder | ئالف | ئالیك |
| Ready (cloth) | ئامادە/ جێکری | ئامادە |
| On alert | ئامادە | ئامادە |
| Presence, be ready | ئامادەبون | ئامادەبوون |
| Preparation, to prepare | ئامادەکرن | ئامادەکردن |
| Organiser, preparer | ئامادەکەر/ بەرهەڤکە | ئامادەکار |
| Statistics, census | سەرژمێر | ئامار |
| Hint, reference, mark | ئامازە/ هێما | ئاماژە |
| Househad utensils, pots and pans | ئامان | ئامان |
| Target, aim, goal | ئارمانج | ئامانج |
| Tool, particle, article | ئالاف/ ئالەت | ئامراز |
| Cousin | پسمام و دۆتمام | ئامۆزا |
| Institute, establishment | پەیمانگە | ئامۆژگا |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Adviser, counsellor | شیرەتکار/ ئامۆژکار | ئامۆژگار |
| Advice | ئامۆژگاری/ شیرەت | ئامۆژگاری |
| Aunt, Father's brother's wife | ئامۆژن | ئامۆژن |
| Tool, instrument | ئامورەت/ ئالاڤ | ئامێر |
| Embrace, containment | همبێز/ همبێزکرن/ بەرسینگکرن | ئامێز |
| Elbow | ئەنیشک/ ئانیشک | ئانیشك |
| Water, juice | ئاڤ | ئاو |
| Hydrology | ئاڤناسی | ئاوناسی |
| Sunset, disappearance | ئاڤابون | ئاوابوون |
| Hope, longing, desire | هیڤی | ئاوات |
| Wishful, hopeful | هیڤیدار | ئاواتەخواز |
| Banished, exiled, homeless, shelterless | مشەختی | ئاوارە |
| Melody, tune | ئاواز | ئاواز |
| To compose, melodize | ئاوازچێکرن | ئاوازدانان |
| Composer | ئاوازدانەر | ئاوازدانەر |
| To construct, innovate, build | ئاڤاکرن/ نوژەنکرن | ئاواکردن |
| Village, inhabited | گوند، ئاڤایی، ئاڤانی | ئاوایی |
| Filter | ئاڤ پالێڤ | ئاوپالێو |
| Toilet, w.c. water closet | دەستاڤ، ئەدەب، ئەدەبخانە | ئاودەس |
| Dew | خوناڤ | ئاوڕینگ |
| Death struggle, agony of death | سەکەرات/ روحدان | ئاوزینگدان |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Silk | ئارمیش | ئاوریشم |
| Gilding | ئاڤ زێر | ئاو زێر |
| Silver ore | ئاڤزیو | ئاوزیو |
| Swallowing, inflammation, infection | وەرمی، گوپکری | ئاوسان |
| Swallen, flammable, inflammable | وەرمتی، گوپکری | ئاوساو |
| Water carrier, pump | ئاڤکێش | ئاوکێش |
| Small pox | سورك | ئاوڵە/ سۆریکە |
| Fetus, embryo | پز/ ئاڤلمە/ کوریەلە | ئاوڵەمە/ کۆرپەڵە |
| Pregnant | ئاڤس ، ب زك | ئاوس/ ئاوس |
| Weather, climate | سەقا/ ئاڤ و هەوا | ئاو و هەوا |
| Sewerage | سۆلین/ بەلوعە | ئاوەڕۆ |
| Opposite, counter, converse | بەرەڤاژی | ئاوەژوو |
| Capsized, turnedover | بەرەڤاژی | ئاوەژوو/ سەراوگێر |
| Companion, comrade | هەڤال | ئاوەڵ |
| Wife's sister's husband | هەڤلینگ | ئاوەڵزاوا |
| Adjective | هەڤالناڤ | ئاوەڵناو |
| Adverb | هەڤالکار | ئاوەڵکردار |
| Knickers - panties | ئەتەك | ئاوەلکراس |
| Mediator, intercessor | ناڤبەر/ ناڤبەرچی | ئاوەندیار |
| Like this, that | هۆسا/ وەسا | ئاوەها |
| So, such | هۆسا | ئاوەها |
| Complex, mixture | لێکدای/ تێکەلك/ تێکەل | ئاوێتە |
| Mirror | ڤۆدیك | ئاوێنە |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Watery, marshy, dew | ئاڤی | ئاویی |
| Sperm, semen | ئاڤین | ئاوی |
| Alas! Sighing, sorrow, grief | ئاهێن | ئاه |
| Groaning | ئاهێن | ئاه وناله |
| Party, vestival, concert | ئاهەنگ | ئاهەنگ |
| Commencement, graduation ceremony | ئاهەنگا دەرچونێ | ئاهەنگی دەرچوون |
| Wedding ceremony<br>Marriage ceremony | داوەت | ئاهەنگی بووك<br>گواستنەوە |
| Oh | ئۆف/ ئای | ئای |
| does? Do | ئەری؟ | ئایا؟ |
| Religion | ئۆل/ ئاین | ئایین |
| Future | داهاتی، پاشەرۆژ | ئاییندە |
| Wile, equivocation | ناز/ مەکر | ئاین و ئۆین |
| Doctrine, belief, dogma, path | مەزهەب | ئاییزا/ ئایینزا |
| Religious | ئاینی/ ئۆلی | ئایینی |
| Heresy, heterodoxy | ئۆلا نوی | ئاینی نویَ/ بیدعە |
| Then | پشتی/ ڤێجا | ئینجا |
| Fault, responsibility | ستۆ | ئۆباڵ |
| Car, automobile | ترۆمبێل | ئۆتۆمبیل |
| Hotel | ئوتێل | ئوتێل |
| Room, chamber | ئۆدە/ ژور | ئۆدە |
| Trip, departure | سەفەر/ وەغەر | ئۆغر |
| Ow! Oh! | ئۆف | ئۆف |
| Patience, tranquility | هەدار | ئۆقرە |

| English | بادینی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| Ocean | ئۆقیانووس | ئۆقیانووس |
| Iron, laundry | ئوتیه | ئوتو |
| Hope | هیڤی | ئومێد |
| Wile, trick | گەند/ حیله | ئۆین |
| Puzzled, piebald | عەجێب گرتی | ئەبلەق بوون |
| Disgrace, corruption | هەتک و نامیس | ئەتك |
| To insult, defame | هەتک برن | ئەتك کردن |
| Atom | ئەتۆم | ئەتۆم |
| Atomistics, atomics | ئەتۆمناسی | ئەتۆمناسی |
| Of course | پاچەوا/ بێ گومان | ئەدی کو |
| Politeness, manner | ئەخلاق | ئەدەب |
| Literature | تورە | ئەدەب |
| Purple | مۆر/ ئەرخوانی | ئەرخەوانی |
| Earth, land, estate | عەرد/ عەدر | ئەرد |
| Cheap | ئەرزان | ئەرزان |
| Archives | ئەرشیو/ ئەرشیف | ئەرشیف |
| Duty, task, function | ئەرک | ئەرك |
| Physiology | ئەرکناسی | ئەرکناسی |
| Experiment, experience | سەربۆر | ئەزموون |
| Examination, test | تاقیکرن | ئەزموون |
| Serpant, snake | مار | ئەژدەر |
| Dragon | ئەژدەها | ئەژدەها |
| To count, calgulate | هژمارتن | ئەژماردن |
| Arithmetic | حیساب | ئەژماردن (زانست) |
| Knee, kneel | چۆک | ئەژنۆ |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Stallion, horse | هەسپ | ئەسپ |
| Trojan horse | هەسپێ تەروادە | ئەسپی تەروادە |
| Calmness, stillness | ب کەڕی/ بێدەنگی | ئەسپایی |
| Bike, bicycle | بایسکل | ئەسپە ئاسنینە |
| Louse | سپی/ سپیە | ئەسپێ |
| Thump | تالا بەرانێ | ئەسپێ کوژە |
| Cervix, burden | سکورد/ ستو | ئەستۆ |
| Loaf, bread | سەوک | ئەستورك |
| Thick | ئەستیر | ئەستوور |
| Column | ستون/ ستین | ئەستوون(رۆژنامە) |
| Pillar, pole, post | دینگە | ئەستوون |
| Vertical | ستواینکی | ئەستوونی |
| Star | ستێر | ئەستێرە |
| Astrology | ستێرناسی | ئەستێرەناسی |
| Reservoir | ئەستێرک | ئەستێڵ |
| Tear | رۆندک | ئەسرین |
| Sponge | ئسفەنج | ئەسفەنج |
| Origin | ئەسل/ رەسەن/ نژاد | ئەسڵ |
| Purebred, highborn, of noble origin | رەسەن | ئەسڵزادە |
| Tear | روندک | ئەشك |
| Torture, agony, rebuke | ئێش/ ئازاردان | ئەشکەنجە |
| Cave | ئەشکەفت/ شکەفت | ئەشکەوت |
| Foe, enemy | دژمن | ئەغیار |
| Myth, legend | ئەفسانە | ئەفسانە |
| Mythology | ئەفسانەزانی/ ناسی | ئەفسانەناسی |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Sorcery | سێڕ/ سحر/ خەفزانک | ئەفسوون |
| Officer | ئەفسەر | ئەفسەر |
| If | ئەگەر | ئەگەر |
| Otherwise | دەنا/ هەکە | ئەگەرنا |
| Doubtless | بێ گومان | ئەڵبەت |
| Diamond | ئەلماس | ئەلماس |
| Missing link, intermediate form | ئەلقە یا بەرزە | ئەلقەی بزر |
| This | ئەڤ | ئەم |
| Store, warehouse | ئەمبار | ئەمار |
| These | ئەڤ/ ئەڤان | ئەمانە |
| Extreme | بێقام/ پەرگر | ئەمپەڕ |
| Now, Then | ڤێجا/ ئەڤجا | ئەمجا |
| Today | ئیرو/ ئەڤرۆ | ئەمڕۆ |
| Tonight | ئەڤشەڤە | ئەمشەو |
| Finger | تل | ئەموست |
| Pitch dark, Gloomy | تل چەهڤ | ئەموستەچاو |
| Then, now | ڤێجا/ ئەڤجا | ئەنجا/ ئەوجا |
| Conclusion | ئەنجام/ ئاکام | ئەنجام |
| Council, assembly, board, court | جڤات | ئەنجومەن |
| Secutity council | جڤاتا تەناهی | ئەنجومەنی ئاسایش |
| Board of trustees | جڤاتا ئەمیندارا | ئەنجومەنی ئەمینداران |
| Constituent assembly | جڤاتا دامەزراندنێ | ئەنجومەنیدامەزراندن |
| Junta | جڤاتا شۆرشێ | ئەنجومەنی شۆڕش |
| assembly parliament | جڤاتا میلەت/ گەل | ئەنجومەنی گەل |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| State consultative council | جڤاتا شیرەتکارا | ئەنجومەنی راوێژ |
| Senate (council) | جڤاتا پیران | ئەنجومەنی پیران |
| National assembly | جڤاتا نیشتمانی | ئەنجومەنی نیشتمانی |
| Council of ministers, cabinet | جڤاتا وەزیران | ئەنجومەنی وەزیران |
| Council of municipality | جڤاتا بازێری | ئەنجومەنی شارەوانی |
| Legislative council | جڤاتا یاسادانان | ئەنجومەنی یاسادانان |
| Executive council | جڤاتا بجێهێنانێ | ئەنجومەنی بەجێهێنان (تەنفیزی) |
| Engineering | ئەندازیاری | ئەندازە |
| Geometry | ئەندازەزانی | ئەندازەزانی |
| Analytic engineering | ئەندازاریا شروڤەکرنی/ شلوڤەکرنی | ئەندازەی شیکردنەوە |
| Engineer | ئەندازیار | ئەندازیار |
| Member | ئەندام | ئەندام |
| Organ | ئەندام | ئەندام |
| Organology | ئەندامزانی | ئەندامناسی |
| Contemplation | هزر و بیر | ئەندێشە |
| Purpose | مەبەست/ مەرەم | ئەنقەست |
| On purpose | ژ قەستێ | (بەدەستی ئەنقەست) |
| Ring | گوستیلک/ گوستیرک | ئەنگوستیلە |
| That | ئەو | ئەو |
| He, she, they | ئەو/ ئەوی/ ئەوێ | ئەوان |
| They | وان | ئەوان |
| Those | ئەو/ وان | ئەوانە |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Extreme, utmost, opposite side | ئەولا/ رەخێ دی/ قامادی | ئەوپەڕ |
| Extremist | پەرگر | ئەوپەڕ |
| Then, now | ئەڤجا | ئەوجا |
| In past | وی دەمی | ئەوسا |
| That | ئەو | ئەوە |
| So, that | هندە/ هند | ئەوەندە |
| One who, one which | ئەوێ کو/ ئەوا کو | ئەوەی |
| There | وێرێ | ئەوێ |
| Another | یا/ یێ دی | ئەویتر |
| Others | یێت/ یێن دی | ئەوانیتر |
| Oh pity! Alas!, woe | هەی هاوار/ هەوارە | ئەیەڕۆ |
| Yes | ئە/ بەلێ/ لەبێ | ئێ |
| Once | ئێکجار | ئێجگار |
| Completely, totally, Extremely | ب جارەکێ | ئێجگارەکی |
| Here | ڤێرێ/ ڤر | ئێرانە، ئێرە |
| Now | نوکە | ئێستا |
| Mule | هێستر | ئێستر |
| Station | ئیزگە/ ئیستگە | ئێستگە |
| Bone | هەستی/ هەستیک | ئێسقان |
| Bone, skeleton | هەستی | ئێسك |
| Cute, affable | دارسڤک/ هەستی سڤک | ئێسك سووك |
| Boorish, dull | دارگران/ هەستی گران | ئێسك گران |
| Skeleton, broken bones | کەلەخ/ قەرقودە | ئێسك و پروسك |
| Pain, ache | ئێش | ئێش |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Painful | ب ئێش | بەئێش |
| Patrol, watching | پاس | ئێشك |
| Watchman | پاسڤان/ زێرەڤان | ئێشكچی |
| Tribe | ئێل | ئێل |
| To vomit | ئێلنج | ئێلینج |
| We | مە | ئێمە |
| Evening, eve | ئێڤاری | ئێوارە |
| Good evening | ئێڤاری باش | ئێوارە باش |
| You | وە/ هین | ئێوە |
| Paralyzed | شەهێ | ئیفلیج |
| Paralysis | ڤالنج/ شەهێ | ئیفلیج/ گۆجی |
| Flowerpot, vassel, vase | قافك | ئینجانە |
| Job, work, labour | شوۆل | ئیش |
| To work | شوۆلكرن | ئیشكردن |
| Worker, labourer | كارگەر/ شوۆلكەر | ئیشكەر |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| B The second letter of the kurdish alphabet | ب | ب |
| Wind, air | با | با |
| Lets | دیٚ، بلا | با |
| Lets go | بلابچین | بابڕۆین |
| Rheumatic, swelling, rheumatic, pain | با | با |
| Father | باب | باب |
| Subject | بابەت | بابەت |
| Grandfather | باپیر | بابە گەورە |
| Grandfather | باپیر | باپیر |
| Tax, poll | باج | باج |
| Collector | باجگر | باجگر |
| Tax office, custom house, toll-house | باجگەه | باجگە |
| Orchard, vineyard | باغ | باخ/ باغ |
| Garden | باخچە/ بەخچە | باخچە |
| Bosom, pocket | بەرک | باخەڵ |
| Gardener | باخچەڤان/ بەخچەڤان | باخەوان |
| Rheumatic | باوی/ باهێنک | بادار |
| Rheumatic, windy | باداری | باداری |
| Almond | با هیڤ | بادام |
| Bending | بادان | بادان |
| To Turn | بادان/ دێور | بادانەوە |
| Wine, drink | بادە/ ئەرەق | بادە |
| Cheers! To your health | نۆش | نۆش! |
| Wine-seller | بادەفرۆش/ ئارەق فرۆش | بادەفرۆش |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Addict (of wine) | ئارەقخۆر، شەرابخۆر | بادە نۆش |
| Load, cargo, burden | بار | بار |
| Mill grain | باراش | باراش |
| Rain | باران | باران |
| Raining | باران بارین/ باران هاتن | باران بارین |
| pulliometer, rain gauge | باران پیڤ | بارانپیو |
| Help, support | ئاریکارکرن | باربوو |
| Store, warehouse | ئەمبار | بارخانە |
| Unloading | بار ئێخستن/ خالی کرن/ ڤالاکرن | بارخستن |
| Loading, pack load | بارگرێدان | بارکردن |
| Volume, bloc, mass | گوڤەک/ قەوارە/ بارست | بارستایی |
| Positive and negative | بارگە | بارگە (کارەبا) |
| Draft horse, big mule, beast of burden | بارگیل/ بارگیر | بارگیر/ بارگین |
| Deposit, hostage | رەڤاندی | بارمتە |
| Goods | مال/ شمەک/ پرتال | بارووبنە |
| Gunpowder | بارود/ باروت | بارووت |
| Headquarters, palace, arsenal | بارەگەه | بارەگا |
| Thin, slim, slender | باریک | باریک |
| Immature (bird) | نەگهیشتی | باڕ |
| Inn | باڕ | باڕ |
| Bleating | باراندن | باڕاندن |
| Tempest | باهۆز | باڕەش |
| Falcon, sparrow hawk | باز | باز |

| English | بادینی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| Jump | باز | باز |
| Skilled, talent | شەهرەزا | باز |
| Bargain, market | بازار | بازاڕ |
| Black market | سیکارەش | بازاڕی ڕەش |
| Merchant, businessman, tradesman | بازرگان | بازرگان |
| Commerce, trading | بازرگانی | بازرگانی |
| Check point | بازگەه | بازگە |
| Bracelet | بازن/ بازنك | بازن |
| Circle | بازن | بازنە |
| Vicious circle | بازنێ ڤالا | بازنەی بۆش |
| Arm, wrist | بازۆ، زەند | بازوو |
| Town, market | باژێر/ سیك | باژێر |
| Arm, forearm | باسك | باسك |
| Good, well | باش | باش |
| Goodness, healthiness | باش | باش |
| South | باشور | باشوور |
| Bleating | باعاندن | باعاندن |
| Bunch | قەفتەك | باق |
| Brightening | تەیساندن | باق و بریق |
| Bleating | باقاندن | باقە باق |
| North | باكور | باكوور |
| Rod-roller | باگوردان | باگردێن(باگوردان) |
| Wing, arm | باسك/ بار | بال |
| Wart | بالور/ بەلالوك | بالووكە |
| Vollyball | ڤۆلی پۆل/ تەپكافرەندە | بالە |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Puberty, sexual maturity, wet dream | بالقبون | باڵەغبوون |
| Farting | تر | باڵی بەربوون |
| Pillow, cu' .ion | بالیف/ بالیڤ/ بالیفک | بالیف |
| Wing | چەنگ | باڵ |
| Arm | باسک | باڵ |
| Height | بەژن | باڵا(بەژن و باڵا) |
| High | بلند اخاندن) | باڵا (بلند) خوێندن |
| Jubbah | بالاپوش | باڵاپۆش |
| Powerful | بهێز/ خورت | باڵا دەست |
| Sacrifice | گوری/ قوربان | باڵا گەردان |
| Bird fowl | بالندە | باڵدار/ باڵندە |
| Building, upperstorey | ئاڤاهی | باڵەخانە |
| Ambassador | بالیوز | باڵیۆز |
| Embassy | بالیوخانە | باڵیۆزخانە |
| Plateau, rooftop, surface | بان | بان |
| Bank | بەنق | بانق |
| Call | بانگ | بانگ |
| Prayer call | بانگ | بانگدان |
| Caller, muezzin | بانگبێژ | بانگدەر |
| Wailing, weeping | لۆرین/ ئاخین | بانگ هەڵدان |
| Midspring season. April | بانەمەر | بانەمەڕ |
| Roof, upper | بانی | بانو |
| Father | باب/ باڤ | باو |
| Fashion, custom, habit | ئادەت / تیتال | باو |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Look, (look like red), reddish | ڤەبی | باو (سورباو) |
| Parents | باب و داک | باوان |
| Father | باب | باوك |
| Fatherhood | باڤتی/ بابی/ باڤی | باوکێتی |
| Faith, belief | باوەر | باوەڕ |
| Trustee | باوەرپێکر | باوەڕپێکراو |
| Believer | خودان باوەر | باوەڕدار |
| Believing, to believe | باوەرکرن | باوەڕکردن |
| Faith, trust | باوەری | باوەڕی |
| Father's wife - step mother | ژنباب | باوە ژن |
| Embrace | ئامبێز/ همبێز | باوەش |
| Fanning, fan | باژەن | باوەشێن |
| Yawn | باوێشک، باوشک | باوێشك |
| Almond | بەهیڤ/ باهیڤ | باوی |
| Bitter almond | ئاژک | باوی تاڵ |
| Eggplant | باینجانئکارەش/ باجان | باینجان |
| Merit, value | بوها/ بەها/ گرنگی | بایەخ |
| Valuable, worthy, priceless | پربەها/ بەرکەتی/ شایستە | بایەخدار |
| Idol | پوت/ بت | بت |
| Paganist, heathenist | پوتپەرست | بتپەرست |
| Temple, idol house | پەرستگەھ | بتخانە |
| Small | بچیک | بچووك |
| Brother | برا | برا |
| Foster brother | برای شیری | برای شیری |
| Friend | هەڤال | برادەر |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Friendship | هەڤالیتی | برادەریتی |
| Nephew, niece | برازا | برازا |
| Brother's wife | ژنبرا | براژن |
| Friendly | براینی | برایانە |
| Fraternity, brotherhood, brotherliness | برایی | برایەتی |
| Transmit, seize, confiscate | برن/ داگیرکرن | بردن |
| Winning, to win, overcome | برن | بردنەوە |
| Grilling, broil | برازگە/ براژتن | برژان |
| Eyelash | مژگان/ برژانك/ مژیلانك | برژانگ |
| Grill | بژارتی | برژاو |
| Hungry | برسي | برسی |
| Hunger, starving | برچینی/ برسیتی | برسێتی |
| Rice | گرار | برنج |
| Eyebrow | برۆ | برۆ |
| Thunder | گورژین/ گورمین | بروسك/ بروسکە |
| Pain | ئێش | بروسك |
| Telegraph | بروسك | بروسك/ بروسکە |
| Progress | پێشڤەچون | برەو |
| Winner, victor, triumphant | سەرکەتی | برەوە |
| Wish, desire | خوزی | بریا |
| Glitter | چریسکە/ تەیسین/ شەوقدان | بریسکە/ بریقە |
| Wound, injury | برین | برین |

| English | بادینی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| Nurse | پەرستار | برین پێچ |
| Wounded | بریندار | بریندار |
| Piece, some, sum | پیچەك | بڕ |
| Vertebral column | کاریتێ پشتێ | بڕبڕاگە |
| Lineage | پشت/ ستوتکا پشتێ | بڕبڕە (پشت) |
| Paragraph | برگە/ بەند | بڕگە |
| Faith, belief | باوەر | بڕوا |
| Trusting | باوەرپێکرن | بڕواپێکردن |
| Justification | هەنجەت | بڕوبیانوو |
| Decision, resolution | بریار | بڕیار |
| Declaration | راگەهاندن/ ئەشکراکرن | بڕیارنامە |
| To cut | بڕین | بڕین |
| Severance, break off, rupture | بڕین | بڕین/ پەیوەندی |
| Lost, missing, absent | بەرزە | بزر |
| Nail | بزمار | بزمار |
| Goat | بزن | بزن |
| Active, restless | چەلەنگ | بزۆك/ بزێو |
| Vowel | بزوێن | بزوێن |
| Smile | گرنژین | بزە |
| Compensation, indemnity | خستنەجێ/ شوندان | بژاردن |
| Living | ژیان | بژێوی |
| Longlive | بژی | بژی |
| Span | بوست | بست |
| Dwarf | بەژن بوست | بستەبالا |
| Chaos | تەڤل هەڤی/بێ سەروبەری | بشێوی |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| | بف/ نەکە | بف |
| Client, buyer | کریار | بکڕ |
| Fatal | کوژ/ مرنی | بکوژ |
| Killer, slaughter | کوژەک/ کوژ | بکوژ |
| Subject | بکەر | بکەر |
| Doer | کرار/ بکەر | بکەر |
| Agent | پێشکار | بکەر |
| Take | بگرە | بگرە |
| Block | بلۆک | بلۆك (خشت) |
| Bloc, camp | گرو/ بەر | بلۆك (بەرەی سیاسی) |
| Nightingale | بلبل | بلبل |
| Crystal | بەلور | بلوور |
| Flute, pipe | بلیل/ بلویل | بلوێر |
| Ticket | پلێت | بلیت |
| Genius | بلیمەت/ ژیر | بلیمەت |
| Spreadout, widespread | بلاو | بڵاو |
| Scattered | بلاو | بڵاو (پەرش و بڵاو) |
| Publishing | بەلاڤکرن | بڵاوکردنەوە |
| Distributing | دابەشکەن/ لێکڤەکرن | بڵاوکردنەوە |
| Announcement | راگەهاندن | بڵاوکردنەوە |
| Dispersion, tear | بەلاتکرن | بڵاوەپێکردن (ئاپۆرە) |
| Bubble, blister | بەقلیشک | بڵق |
| Mumbling, murmuring | پلتەپلت | بڵمەبڵم |

| English | بادينى | سۆرانی |
|---|---|---|
| High, dizzle | بلند | بڵند |
| Say | بێژە | بڵێ |
| Blaze, flame | گورە/ گورى | بڵێسە |
| Bottom | بن | بن |
| Under, beneath | بن/ ژێر | بن |
| Foot of ahillor mountain, foothill | بەنار/ دامێن | بنار |
| base, ground, foundation | بناغە | بناغە |
| Armpit | پاخل/ بن کەفش | بن باخەڵ |
| Ceiling | بان | بنمیچ |
| Family, dynasty | مالبات/ بنەمال | بنەماڵە |
| Reservoir, dam, source | بەند | بنەوان |
| Violet colour | بنەڤشى | بنەوشەیی |
| Gum | بینیشت | بنێشت |
| For, to | بو | بۆ |
| Inorder to, so as to, to | ژ بەرکو | بۆ ئەوەی |
| Why? | ژ بەرچى/ بوچى | بۆچی |
| Grey | بۆز | بۆر |
| Bombardment | بوردمان | بۆردومان |
| Storm, tempest | تیفان/ بالوڤە | بۆران |
| Moaning, yelling | بورين/ ڤیژین | بۆران/ بۆراندن |
| Tube, pipe, canal | بورى | بۆری |
| Gray | بوز | بۆز |
| Hideout, ambush | بوسە/ مەلاس | بۆسە |
| Empty, vacant | ڤالا | بۆش |

| English | بادینی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| Blank, gap, hollow | ڤالەهی/ ڤالاتی | بۆشایی |
| Space | ڤالاییا ئەسمانی | بۆشایی ئاسمان |
| Frog | بەق | بۆق |
| Grumble | بول بولکرن | بۆڵەبۆڵکردن |
| Bomb | بۆمبا | بۆمبا |
| Bombardment | بومباباران | بۆمباباران |
| Perfume, smell | بێن، بێهن | بۆن |
| Factor, cause, occasion | بویەر/ هەلکەفت | بۆنە |
| Polish | بویاغ/ رەنگ | بۆیاخ |
| Shoeshineboy | بویاغچی | بۆیاخچی |
| Paint | بویاغ/ رەنگ | بۆیە |
| Painter | بویاغچی | بۆیەچی |
| Necktie, tie | قرەوات | بۆینباخ |
| Field, aspect | بوار/ بیاڤ | بوار |
| False, accusation | بوختان/ بوهتان | بوختان |
| Bundle | بوخچە/ بوقچە/ بوخچك | بوخچە |
| Earthquake | بیڤەلەرز | بومەلەرزە |
| Seismology | بیڤەلەرزناسی | بومەلەرزەناسی |
| Leaveout, skip | هێلان/ پیتەپێنەدان | بووراردن |
| Budget | بودجە | بووجە/ بودجە |
| Faint | گێژبوون | بوورانەوە |
| Reviving, invigorating | ڤەژین | بووژانەوە |
| Bride | بیك | بووك |
| Doll, toy | لیزۆك/ لەیزۆك/ لەیستون | بووکە شوشە |
| Bridal | بووکاتی | بووکێنی |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Nuptial night | شەڤابیکینی/ زاڤاهیتیێ | شەوی بووکێنی |
| Earthquake | هەژان/ عەرد لڤین | بوومەلەرزە |
| Existence | هەبوون/ بوون | بوون |
| Ontology | بوونناسی | بوونناسی |
| Poet | هوزانڤان | بوویژ |
| According to, due to | ل دیڤ | بەپێی |
| Empty | خالی / ڤالا | بەتاڵ |
| Blanket | بەتەنی | بەتانی |
| Puppy | کوندە | بەچکە |
| Luck, fortune, fate | بەخت/ شانس | بەخت |
| Fortune-teller, diviner, soothsayer | فال ڤەکر/ خەفزان | بەختگرەوە |
| Lucky | بیەخت | بەختدار |
| Unlucky | خولی بسەر/ بێ بەخت | بەخت رەش |
| Donation | دان/ بەخشان | بەخش |
| Generous, merciful | بەخشندە | بەخشندە |
| Gift, grant, tip | بەخشیش | بەخشیش |
| Upbring, raise | خودانکرن | بەخێوکردن |
| Bad | بەد/ خراپ | بەد |
| Unfortunate, unlucky, miserable | بەدبەخت | بەدبەخت |
| Pessimist | بەدبین | بەدبین |
| Evildoer | بەدکار | بەدکار |
| Fruit, outcome, product | بەر | بەر |
| Prior | بەری | بەر |

| English | بادينى | سۆرانى |
|---|---|---|
| Pubic hair | روفكى بن زكى/ ريفى/ روفى | پەر/ مووی بن زگ |
| Gift, favour, allowance | دیاری | بەرات |
| Pig, swine | بەراز | بەراز |
| Opposite, versus | هەمبەر/ بەرابەر/ بەرانبەر | بەرامبەر |
| Ram | بەران | بەران |
| Comparative | بەرەهڤدا | بەراوردکردن |
| Barber, hairdresser | بەربەر | بەربەر |
| Bribe | بەرتیل | بەرتیل |
| Obstacle | ئاستەنگ | بەربەست |
| Responsible | بەرپرسیار/ بەرپرس | بەرپرسیار |
| Responsibility | بەرپرسی | بەرپرسیاری |
| Lamb | بەرخ | بەرخ |
| Abortion | بەرئاڤێتن | بەرخستن |
| Stone | بەرد/ بەر | بەرد |
| Petrology | بەرناسی | بەردناسی |
| Millstone | بەراش/ بەرئاش | بەرداش |
| To release, discharge, set | بەردان | بەردان |
| High | بلند | بەرز |
| Interest | بەرژەوەندی | بەرژەوەندی |
| Apron | بەرکۆش/ بەرمالك/ بەرڤانك | بەرکۆش |
| Cover, volume | بەرگ | بەرگ |
| Tailor | د رونکەر | بەرگدروو |
| Defence, defense | بەرەڤان | بەرگری |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Rug, mat | شەملك | بەرماڵ/ دوگرد |
| Remnant, residue | بەرمای، بەرمایە | بەرماوە |
| Barrel | بەرمیل | بەرمیل |
| Collar | بەرستو/ بەرسینگ | بەرۆك |
| Date | بەروار | بەروار |
| Apron | بەردلك، بەرکوش | بەروانکە |
| Outcome, result, product | بەرهەم | بەربووم |
| Obstacle | ئاستەنگ | بەرهەڵست |
| Resistance | بەرخوەدان/ دەیاغ/ بەرگری | بەرهەڵستی |
| Production, outcome | بەرهەم | بەرهەم |
| Generation | نەڤە/ نفش/ پشت | بەرە |
| Front | بەرە | بەرە |
| Battlefield, battleground | بەرە | بەرەی جەنگ |
| Gradually, step by step | بەرەبەرە | بەرەبەرە |
| Dawn | بەرەبەیان/ بەرەبانگ/ ئاریبار | بەرەبەیان |
| Licentiousness, profligacy, pornography | بەرهەلا | بەرەڵڵا |
| Free | ئازاد/ سەربەست | بەرەڵڵا |
| Into, about, toward | بەرەڤ | بەرەو |
| Palm | هەڤێس/ کەفادەست | بەری دەس |
| Infact, actually | براستی | بەراستی |
| Oak | بەڕی | بەڕو |

| English | بادینی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| Administration | کارگێڕی | بەڕێوەبردن |
| Director, manager | ڕێڤەبەر/ بەرگەر | بەڕێوەبەر |
| Directorate | ڕێڤەبەریا | بەڕێوەبەرێتی |
| Fat, tallow, suet | بەز | بەز |
| Party, amusement | بەزم | بەزم |
| Sin, guilt | گونەھ | بەزە |
| Sinner, guilty | گونەھکار | بەزەکار |
| Mercy, pity | دلوڤانی/ میهرەبانی | بەزەیی |
| Defeat | شکەست/ رەڤین | بەزین |
| Dryland | هشکاتی | بەژ |
| Height and appearance | قەد و قامەت | بەژن و باڵا |
| Height, physique, stature | بەژن | بەژن |
| Waist | بەژن | بەژن |
| Enough | بەس | بەس |
| Aged, advanced in years | دان عومر | بەساڵاچوون |
| Connection, joining, tieup | گرێدان | بەستنەوە |
| Dam | بەست | بەست |
| Icecap | کولاڤکێ جەمەدێ | بەستەڵەك |
| Happening, event | سەرهاتێ | بەسەرهات |
| Share, portion, allotment | پشك | بەش |
| Department | پشك | بەش |
| Heir | میراتگر/ پاشماکگر | بەشبەر |
| Division, partition | بەش بەشکرن | بەش بەشکردن |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| **Deprived** | بێبەش/ بێبەشکری | بەشخوراو |
| **Participant**<br>**Collaborator** | پشکدار | بەشدار |
| **Participation**<br>**Contribution** | پشکدار بون | بەشداربوون |
| Snow | بەفر/ بەرف | بەفر |
| Snow water | شلوقە/ لولاف | بەفراو |
| Snow shovel, snow plough | بەرف مەرێل | بەفرمال |
| Greengrocer | بەقال | بەقاڵ |
| Generally | بگشتی | بەگشتی |
| To generalize | بگشتی کرن | بەگشتی کردن |
| Free | بەلاش | بەلاشی |
| Boat | بەلەم | بەلەم |
| Calamity | بەلا | بەلا |
| But | بەلام | بەلام |
| Phlegm, mucus | بەلغەم/ چلم/ چلموك | بەلخەم/ بەلغەم |
| Also | بەلكی | بەلكو |
| Evidence | بەلگەه | بەلگە |
| Document | دەستاڤێز/ باوەرنامە | بەلگەنامە |
| Piebald | بەلەك | بەلەك |
| Yes | بەلێ | بەلێ |
| Vow, promise | سوز | بەلێن |
| Contractor | گرێدار/ بەلێندەر | بەلێندەر |
| Recently | بەردەمەك كورت | بەمزووانە |
| Recently | ڤێ دوماهیێ | بەمدوایانە |
| Rope, thread, lace | وەریس | بەن |

| English | بادینی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| Article | بەند | بەند |
| Slavery | بەنیتی/ بەندەتی/ کولەتی | بەندایەتی/ کۆیلایەتی |
| Dam | بەست/ سکر/ ئاف بەند | بەنداو |
| Slave | بەنی | بەندە |
| Port, harbour | بەندەر/ لەنگەرگەه | بەندەر |
| Prisoner | گرتی | بەندی |
| Jail, prison | گرتیکە/ گرتیخانە/ حەبس | بەندیخانە |
| Jailer, jailor | زینداناڤان | بەندیوان |
| Petrol | بەنزین | بەنزین |
| Petrol station | بەنزیخانە | بەنزیخانە |
| Hashish, hemp | بەنگ | بەنگ |
| Value | بەها/ بوها | بەها |
| Spring | بهار | بەهار |
| Spices | بهارات | بەهارات |
| Pretense, pretext | هێنجەت/ بەهانە | بەهانە |
| Gift, talent | هونەر | بەهرە |
| Talented | هونەرڤان/ هونەرمەند | بەهرەمەند |
| Paradise | بهەشت | بەهەشت |
| Untilled land, barren land, heath | بەیار | بەیار |
| Morning | سپێدە | بەیان |
| Veterinary surgeon | پزیشکێ بەیتاری | بەیتال/ پزیشکی ئاژەڵی |
| Splint | جەبار | بەیتار |

| English | بادینی | سۆرانی |
| --- | --- | --- |
| Orthopedics, bonesetting | جەباری | بەیتاری |
| With out | بێی | بێ |
| Ignorant, unaware | بێئاگەه | بێئاگا |
| Infidel, faithless, pagan (ist) | بێدین/ بێ ئول | بێ ئایین |
| With out | بێبێ | بێئەوەی |
| Unemployed | بێ شول | بێ ئیش |
| Fickle, opportunist, chameleon | مرۆڤێ دەمدەمی/ کەرپەسە | بێبار |
| Too deep | گەلەک کویر/ گەلەک کور | بێبن |
| Bottomless | بێبن | بێبن |
| Groundless | بێبنیات/ بێبنەجە | بێبنج |
| Innocent | بێگونەه/ روسپی/ داوپاک | بێتاوان |
| Wireless | بێتێل | بێتەل |
| Baby, infant, young of | تێشک | بێچوو |
| Aversion | دل ژێمای/ بێز | بێز/ قێز |
| Sieve | ئێلەک/ هێلەک | بێژنگ |
| Finance support | بێش/ هاریکاری | بێشە |
| Cradle | لاندک | بێشکە |
| Corvee | بیگار/ زەود | بیگار |
| Foreigner | بێگان/ بێگانە/ بیانی | بێگانە |
| Spade | مەربێل | بێل |
| Brainless, stupid | بێمەژی | بێمێشك |
| Menstruation | خوین دیتن/ بێنڤێژی | بێنوێژی |
| Unique, incomparable | بێهەمیا/ بێهەڤژی | بێهاوتا |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Widower | بێژن/ مێرەبی | بێوەپیاو |
| Widow | بێژن | بێوەژن |
| Desert | بەیابان | بیابان |
| Excuse, pretext | هەنجەت/ بەهانە | بیانوو |
| Look, face | روی | بیچم |
| Twenty | بیست | بیست |
| Hearing, listening | بهیستن | بیستن |
| Pupil | رەشکا چاڤان | بیلبیلە |
| Pepper | بیبەر | بیبەر |
| Thought | هزر | بیر |
| To think | هزرکرن | بیرکردنەوە |
| Well | بیر | بیر |
| Theory | بیردوز | بیردۆز |
| Thinking | هزرکرن | بیرکردنەوە |
| Thought, idea | هزرەك | بیرۆکە |
| Insurance | دابینکرن | بیم |
| Fear, scare | ترس/ تەرس | بیم |
| Architectonics | ئاڤاهیزانی | بیناسازی |
| Sight, optical | دیتن | بینایی |
| Optics | دیتنزانی/ بینینزانی | بینایناسی |
| To see | دیتن | بینین |
| To meet | دیتن | بینین |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| P The third letter of the kurdish alphabet | پ | پ |
| Foot | پی | پا |
| Ship | پاپور | پاپۆر |
| Battery | پاتری | پاتری |
| Pickaxe | مەربێل | پاچ |
| Reward, prize | خەلات | پاداش |
| King, monarch | پاشا | پادشا |
| Last year | پار | پار |
| Wet, moist | تەر | پاراو |
| Party | پارتی | پارتی/ حیزب |
| Piece, shell | پارچە | پارچە |
| Smash | پارچەپارچەکرن | پارچەپارچەکردن |
| Flock, herd | کەر | پارچە مەرکەر |
| Balance, scale | پارسەنگ/ هەڤسەنگ | پارسەنگ |
| Last meal, before dawn | پاشیڤ | پارشێو |
| Morsel, bite, mouthful | پاری | پاروو |
| Money | پارە/ دراڤ | پارە |
| Spending money in vain | دەستبەردان | پارەبەفیڕۆدان |
| Mintage, strike a coin | سکە | پارەلێدان |
| Embezzlement, pilferage defalcation, stealing, | پارەبرن | پارەلێدان |
| Diet | پارێز | پارێز |
| Governorate | پارێزگاه | پارێزگا |

| English | بادینی | سۆرانی |
|---|---|---|
| Governor, mayor | پارێزگەر | پارێزگار |
| Lawyer | پارێزەر | پارێزەر |
| Beseach | لاڤ لاڤ | پاڕانەوە |
| Heel | پەحنی | پاژنە |
| Pass, guard | زێرەڤانی | پاس |
| Guard | زێرەڤان | پاسەوان |
| Anarchy | پاشقەچوون | پاشاگەردانی |
| Later | پاشی | پاشان |
| Kingship, monarchy | پاشایەتی | پاشایەتی |
| Delay, defer | گیروکرن | پاش خستن |
| Suffix | پاشگر | پاشگر |
| Repent, regret | پەشێمانی | پاشگەزبوونەوە |
| Remainder | پاشمایک/ بەرمایک | پاشماوە/ بەرماوە |
| Autopsy | غەیبەت | پاشملە |
| Afternoon | پشتی نیڤرۆ | پاشنیوەڕۆ |
| Waste product, leftovers | پاشمای | پاشەڕۆك |
| Future | پاشەرۆژ | پاشەڕۆژ |
| Saving, deposit | لێکدان | پاشەکەوت |
| Back | پشت | پاشەوە |
| Sweets | بەقلاوە | پاقلاوە |
| Bean | باقلك | پاقلە |
| Clean | پاقژ | پاك |
| Exculpatory plea, excuse | گەردن ئازاکرن | پاکانە |
| Tax | خویك | پارکانە |
| Purification | پاقژبوون | پاکبوونەوە |

frustration/frʌˈstreɪʃn/n بێ ئومێدی
fry/fraɪ/n سوورەکراوە
frying pan/n تاوە
fudge/fʌdʒ/n ١- حەلوا، شیرینەمەنی
٢- ناڕاستەوخۆ هەندێ شت دەڵێ
fuel/ˈfju:əl/n-v ١- سوتەمەنی
٢- پەکەوپ دەخا ، گڕ دەگرێ
fugitive/ˈfju:dʒətɪv/n هەڵاتوو لە دادگا، ڕاکردوو
fulfill/fʊlˈfɪl/v ١- جێبەجێ دەکا
٢- دەهێنێتە دی ٣- ڕادەپەڕێنێ ٤-ڕازی دەبێ
full/fʊl/adj ١- پڕ ٢- تێر
٣- جمەی دێ، ڕاستەوخۆ
in full بەتەواوی
in full swing لە لوتکەی هەرەتی، چالاکی
full-blown/adj تەواو پەرەسەندوو، گەشەکردوو
full-moon/n مانگی چواردە
مانگ شێوەی بازنە وەردەگرێ
full stop/n خاڵ، نوقتە
full-time/adj -n تەواوی ڕۆژ/کۆتایی
fully/ˈfʊli/adv بەتەواوی
fumble/ˈfʌmbl/v دەکەوێ
لە گیرفانی دەگەڕێ
fume/fju:m/v هەست بەتووڕەیی دەکا، دەوروژێ
fumes/fjumz/n دوکەڵ- گازی خنکێنەر
fun/fʌn/n ڕابواردن
make fun of پێی ڕادەبوێرێ، گاڵتەی پێدەکا ...
function/ˈfʌŋkʃn/n - v ١- ئەرک
٢- ڕوداوی گرنگ ٣- پۆست
٤- کاردەکا، ئەرکی .. وایە
functional/ˈfʌŋkʃənl/adj کرداری، کاریی
function key/n کلیلی فەرمان
fund/fʌnd/n - v ١- پارەی کۆکراوە بۆ مەبەستێ ٢- پارەی هەڵگیراو لە بانق
٣- پارە دەدا، پارە لە ... خەرج دەکا
fundamental/ˌfʌndəˈmentl/adj بنچینەیی، بنەرەتی/ بونیادگەری
fundamentally/adv بنەرەتیانە، لە بنەرەتەوە
fundamentalism /ˌfʌndəˈmentəlɪzəm/n بنەچەگەری/ بونیادگەری
ڕێوڕەسمی بە خاك سپاردن
funeral/ˈfju:nərəl/n ڕێوڕەسمی بە خاك سپاردن
fungi/ˈfʌŋgi, -gaɪ, ˈfʌndʒaɪ/n کەروو
fungus/ˈfʌŋgəs/n قارچك
funnel/ˈfʌnl/n ١- ڕوحەتی، ئەوت پاڵێو
٢- دوکەڵکێش
funny/ˈfʌni/adj ١- پێکەنین هێنەر
٢- سەیر و نائاسایی٢- ڕوخۆش
fur/fɜ:(r)/n فەرو، کوڵك
furious/ˈfjʊəriəs/adj تووڕە، هارو هیچ- توند، ڕەق
furnace/ˈfɜ:nɪs/n فرنی، تەنوور
furnish/ˈfɜ:nɪʃ/v کەلوپەل لەناو ماڵ دادەنێ، ڕێك دەخا
furnished/adj بە کەلوپەل، ڕایەخراو
furnishings/n کەلوپەل، مافور، ڕایەخ ..
furniture/ˈfɜ:nɪtʃə(r)/n کەلوپەل
furrow/ˈfʌrəʊ/n ١- هێلی ناو کێڵگە- جۆگە-خەت ٢- لۆچ، ئۆچپ
further/ˈfɜ:ðə(r)/adj-adv ١- دوورتر
٢- زێدە ٣- زیاتر
further more/adv ئەمەش زیاتر، وێڕای ئەمەش
further education/n فێرکردنی زێدە
فێرکردنی ئەو کەسانەی خوێندنیان بەجێ هێشتوە
furthest/ˈfɜ:ðɪst/adj - adv دوورترین

freighter/ˈfreɪtə(r)/n کەشتی یان فڕۆکەی بار هەڵگر
French/frentʃ/n فەرەنسی
frenzy/ˈfrenzi/n ١- هەژین – هەڵچون ٢- شێتکێتی کێوی و هەڵچو
frequency/ˈfri:kwənsi/n ١- چەند پات بوونەوە ٢- دوبارە بوونەوەی ئاسایی ٣- لەرە
frequent/ˈfri:kwənt/adj زۆر ڕوودەدا، دوپات، زۆر
frequent/v زۆر دەچێتە جێیەك
fresh/freʃ/adj ١- سازگار، زوڵاڵ ٢- نوێ- جیاواز ٣- تازە ٤- هەساوە ٥- زۆر سارد ٦- لە قوتو نەبێ
freshen/ˈfreʃn/v ١-پاقژدەکا، گیانی وەبەردێنێتەوە ٢- توند دەبێ ٣- خۆی دەشوا
fresher: freshman/n قوتابی قۆناغی یەکەم لە زانکۆ
fret/fret/v نیگەران دەبێ
friction/ˈfrɪkʃn/n ١- لێکخشاندن ٢- ناکۆکی
Friday/ˈfraɪdeɪ/n ڕۆژی هەینی
fridge/frɪdʒ/n ئاوساردکەر، ئاو تەزێنەر بەفرگر
friend/frend/n برادەر، لایەنگر
friendless/ˈfrendləs/n بێ برادەر/بێ‌ڕوو
friendly/ˈfrendli/n-adj ڕووخۆش، خۆشەویست، ڕێك
friendship/ˈfrendʃɪp/n هاوڕێیەتی، برادەرایەتی
fright/fraɪt/n ترس، تۆقین
frighten/ˈfraɪtn/v دەتوقێنێ
frightening/ˈfraɪtnɪŋ/adj تۆقێنەر
frightful/ˈfraɪtfl/adj زۆر خراپ، زۆر، زۆر مەزن- ترسێنەر
frigid/ˈfrɪdʒɪd/adj ئافرەتێکی ساردە لە ڕووی سێکسییەوە/ ساردو سڕ
frill/frɪl/n ١- لێواری کراس ٢- ڕازاوە- ناپێویست بەڵام بەردل
fringe/frɪndʒ/n ١- پەرچەم- قاقڵ ٢- دەممەنی ڕازاوە ٣- لێوار، دەرەوەی...
frisk/frɪsk/v ١-دەگەڕێ- دەپشکنێ ٢-هەڵبەزو دابەز دەکا
fritter/ˈfrɪtə(r)/v بەفیڕۆ دەدات (کات و پارە)
frivolity/frɪˈvɒləti/n بێهودەیی، گەمژەیی، ڕەفتاری ئارێك
frizzy/ˈfrɪzi/adj پرچ لوول
frock/frɒk/n کراس، فوستان/ ڕۆب
frog/frɒg/n بۆق
frogman/ˈfrɔ:gmən/n مەلەوان، ژێر دەریا کەر
from/frəm/prop لە
front/frʌnt/n پێشەوەی، پێش، بەرەی جەنگ- گۆرەپان
frontal/ˈfrʌntl/adj لە پێشەوە
frontier/ˈfrʌntɪə(r)/n سنوور، توخوب
frost/frɒst/n کرێوە، زۆر سارد
frosting/ˈfrɒstɪŋ/n بەستن، زوقم
froth/ˈfrɒθ/n - v ١- بلق، کەف ٢- کەف و چەوری سەرچێشت (لە کاتی کوڵان) ٣- کەف دەکا، لیك دەکا
frown/fraʊn/n گرژبوون،مۆن،خۆمۆن کردن
frozen/frəʊˈzən/v بەستو، تەزیو
fruit/fru:t/n ١-مێوە ٢-بەرهەمی مێوە ٣- بەرووبوم
fruitful/ˈfru:tfl/adj بەرهەمدار، ئاکامدار
fruitless/ˈfru:tləs/adj بێ بەر، نەزۆك، بێ ئاکام
frustrate/frʌˈstreɪt/v ١- لێ ناگەڕێ- بێ ئومێدی دەکا ٢- دادەمرکێنێ
frustrated/adj بێ ئومێد

foyer/ˈfɔɪeɪ/n دەروازەی هۆڵ/دیوەخان

fraction/ˈfrækʃn/n ١– بەش٢– کەرت

fracture/ˈfræktʃə(r)/n شکانی ئێسك

fragile/ˈfrædʒaɪl/adj بۆش، زوو دەشکێ، بەترگزەیە

fragment/ˈfrægmənt/n-v
شکان– تەلەزم
پارچە پارچەی ...– پارچە پارچە دەبێ

fragrance/ˈfreɪgrəns/n بۆنی خۆش

fragrant/ˈfreɪgrənt/adj بۆن، بۆنخۆش

frail/freɪl/adj لاواز– رەقەڵە

frailty/ˈfreɪlti/n لاوازی ئاکاری فیزیکی

frame/freɪm/n ١– چوار چێوە
٢– چوارچێوەی چاویلکە٣– پەیکەر

frame/v ١– چوارچێوە دادەنێ
٢– دەردەبڕێ ٣– تۆمەی پێوە دەلکێنێ

framework/ˈfreɪmwɜːk/n پەیکەر–
چوارچێوە– قالب

franc/fræŋk/n فرەنک–
دراوی فەرەنسی– بەلجیکی و سویسری

franchise/ˈfræntʃaɪz/n
١– مافی بەشداری کردن لەدەنگدان
٢– بریکاری کۆمپانیا ٣–زێدەماف

frank/fræŋk/adj قسە لەڕوو، راشکاو

frankly/ˈfræŋkli/adv ١– بەراشکاوی
٢– بەڕاستی، بەدروستی

frantic/ˈfræntɪk/adj ١– نیگەران– پەشێو
٢– هەژیو– بە هەڵپە، سەرقاڵ

fraternal/frəˈtɜːnl/n برایی، برایانە

fratricide/ˈfrætrɪsaɪd/n براکوژی

fraternity/frəˈtɜːnəti/n ١– برایەتی
٢– هاوکاری، پەیوەندی

fraud/frɔːd/n ١– گزی، فێڵ
٢– گزیکار، فێڵباز

fraught/frɔːt/adj ١– پڕە– لە پڕیا
دەتەقێتەوە
لە توڕەیی یا دەتەقێتەوە
٢– نیگەران و دەمارگیر، توڕە

fray/freɪ/v شاو ، پەرش و بلاو

freak/friːk/n ١–ڕوداوێکی کەسێکی سەیر
٢– شەیدا، خەریك– مژوڵ بۆخۆشی
٣– شاز– نائاسایی

freckle/ˈfrekl/n خاڵ، نیشانە، خوریکەدار

free/friː/adj - v ١– ئازاد
(لە دەرەوەی زیندان، قەفەس)
٢– ئازاد– سەربەخۆ ٣– دوور لە ، بێ
٤– بە خۆرایی، بەلاش ٥– قالا، چۆڵ ، بە تاڵ
٦– نامژوڵ، سەرقاڵ نەبی

free enterprise/n بازاری ئازاد

free speech/n مافی رادەربڕین

freedom/ˈfriːdəm/n ئازادی، سەربەستی، خۆرزگارکردن

freefone/ˈfrɪːfəʊn/n تەلەفۆنکردنی بەخۆرا

freelance/ˈfriːlɑːns/n کرێکاری سەربەخۆ

freelance journalist/n رۆژنامەنوسی سەربەخۆ

freely/adv ١– بەئازادی
٢– بەبێ نیگەرانی– خۆهێشتی

freemason/ˈfriːmeɪsn/n فەرمەسۆن

freepost/ˈfriːpəʊst/n پۆستی خۆرایی

freeze/friːz/v ١–دەبەستێ، دەیبەستێ
٢– لەسەرما دەمرێ
٣– پلەی گەرما بەرەو خوارەوەی سفر دەچێ
٤– لە ناکاو لە ترسا بێدەنگ دەبێ–
زمان لاڵ دەبێ ٥– نرخ و کرێ دیار دەکا

freeze/n ١– ماوەی بەستان
٢– دیارکردی نرخ وکرێ

freezing-point/n پلەی بەستن

freezer/ˈfriːzə(r)/n فریزەر

freight/freɪt/n ١– گواستنەوەی بار
٢– کەلوپەل

formidable/ˈfɔːmɪdəbl/adj ١- ترسێنەر
٢- دژوار
formula/ˈfɔːmjələ/n پێکهاتە- هاوکێشە-
فۆرموڵە، پلان
formulate/ˈfɔːmjuːleɪt/v پیلان دادەنێ،
دەربڕین، دادەڕێژێ، شرۆڤە دەکا
forsake/fəˈseɪk/n بەجێ دێڵێ، واز لێدێنێ
fort/fɔːt/n قەڵا
forthcoming/ˌfɔːθˈkʌmɪŋ/adj
ئایندەی نزیک
لەداهاتوی نزیک دەقەومێ
یارمەتیدەر، هاریکار
forthright/ˈfɔːθraɪt/adj ئاشکرا،
بێپێچ وپەنا- ڕاست ودروست
forthwith/ˌfɔːθˈwɪθ, -ˈwɪð/adv
هەرئێستا، دەست بەجێ، هەنوکە
fortify/ˈfɔːtɪfaɪ/v بەهێز دەکا،
شوێنێ خۆی توندەدەکا
fortification/ˌfɔːtɪfɪˌkeɪʃn/n
بەهێزکردن، توندکردن
fortnight/ˈfɔːtnaɪt/n دوو هەفتە
fortnightly/ˈfɔːtnaɪtli/adv-adj
هەردوو هەفتە جارێ
fortress/ˈfɔːtrəs/n قەڵا
fortunate/ˈfɔːtʃənət/adj خۆش بەخت،
بەبەخت
fortunately/adv خۆشبەختانە
fortune/ˈfɔːtʃuːn/n قەدەر، بەخت-
چارەنووس، سامان
fortune-teller بەختگرەوە/فالچی
forty/ˈfɔːti/number چل
fortieth/ˈfɔːtiəθ/pron-det-adv چلەم
forum/ˈfɔːrəm/n یانەی گفتوگۆ، کۆڕگە
forward/ˈfɔːwəd/adv بۆ پێشەوە
forward-looking/adj بەرەو داهاتوو،
ئایندەیی

forward/adj داهاتوو- ئایندە-
پێشکەوتوو- بە ئاست
forward/v دەنێرێ
forwarding address/n ناونیشانی نوێ
forward/n هێرشبەر
fossil/ˈfɒsl/n ١-پاشماوەی گیانەوەر یاخود
ڕووەکی بەردبوو
٢-کۆنەخواز
foster/ˈfɒstə(r)/v ١- بەخێوکردنی منداڵی
بێماڵ وحاڵ- گرتنەخۆی منداڵی
بێماڵ وحاڵ ٢- هاندەدا
foul/faʊl/adj ١- پیس، ناخۆش،
بۆنی لێدێ ٢- ناخۆش، بێ میزاج
٣- باراناوی، باهۆزاوی، ڕەشەباو تەماوی ..
٤- (زمانێکی) پیسی هەیە، جوێناوی، ناشرین
foul/n ١- فاول (لەیاری)٢- تاوان
foul/v فاول دەکا
found: find/v دۆزیەوە
found/faʊnd/v ١- دادەمەزرێنێ
٢- پێکدێنێ٣- لەسەر بینادەکا
foundation/faʊnˈdeɪʃn/n ١-دامەزراندن
٢-دامودەزگا ٣- بنەما، شەنگست
٤- بناغە- بنەمای هزری
founder/ˈfaʊndə(r)/n دامەزرێنەر
founder member/n ئەندامی دامەزرێنەر
founder leader/n سەرۆکی‌دامەزرێنەر
ڕابەری دامەزرێنەر
foundry/ˈfaʊndri/n قالب، چوارچێوە
تواندنەوە، چوارچێوە وەرگرتن
fountain/ˈfaʊntən/n ١- فوارە٢- کانی
four/fɔː(r)/number چوار
on all fours لە سەر چواریەل، لەسەر زگ
fourth/ˈfɔːθ/pron - det - adv چوارەم
fourteen/ˌfɔːˈtiːn/number چواردە
fowl/faʊl/n باڵندە، مریشك
fox/fɒks/n ڕێوی
fox-hunting/n ڕاوی ڕێوی- ڕاوە ڕێوی

forceful/ˈfɔːsfl/adj به هێز
forceps/ˈfɔːseps/n ماشەی دکتۆر/گیرە
ford/fɔːd/n تەنکاو
Fore/n پێشەوە
Fore/adv بەرەو پێشەوە
forearm/ˈfɔːrɑːm/n باسك، قۆڵ
foreboding/fɔːˈbəudɪŋ/n شووم، پێشبینیشەر(خراپە)
forecast/ˈfɔːkɑːst/v - n پێشبینی دەکا
١- پێشبینی کردن ٢- کەش و هەوا- سەقا
forecourt/ˈfɔːkɔːt/n بەردەرگای باڵەخانە
forefinger/ˈfɔːfɪŋɡə(r)/n پەنجەی شایەتمان
forefront/ˈfɔːfrʌnt/n پێشەوە، پێشەنگ
foreground/ˈfɔːɡraund/n ١- پێشەوەی (وێنە) ٢- ڕیزی پێشەوە (شوێن)
forehead/ˈfɔːhed/n نێوچەوان- ناوچەوان
foreign/ˈfɔːrɪn, ˈfɒrɪn/adj ١- بیانی ٢- دەرەوە ٣- سەیر
foreigner/ˈfɒrənə(r)/n کەسی بیانی- بێگانە
foreign secretary/n وەزیری دەرەوە
foremost/ˈfɔːməust/adj ناسراوترین، گرنگترین
forename/ˈfɔːneɪm/n ناوی یەکەم، ناوی کەسی
forensic/fəˈrensɪk/n نوژداری
لێکۆڵینەوە لە جەستە بۆ دۆزینەوەی تاوان
forerunner/ˈfɔːrʌnə(r)/n ڕابەر، پێشرەو
foresee/fɔːsiː/v پێشبینی دەکا
foresight/fɔːsaɪt/n دووربین
forest/ˈfɒrɪst/n دارستان
forestry/ˈfɒrɪstri/n زانستی دارستان
foretell/fɔːˈtel/v پێشبینی دەکا
forever/fərˈevə(r)/adj هەمیشە- هەتاهەتایی
foreword/ˈfɔːwɜːd/n پێشەکی

forfeit/ˈfɔːfɪt/n ١-پێ دەبڕێری- سزای دەدا ٢-ون دەکا، گوم دەکا، دەدۆڕێنێ
forge/v ١-دەشێوێنێ
٢- پەیوەندی .. دروست دەکا
٣-بەرەو پێش دەجوڵێ
forger/n ساختەکار، تەزویرچی
forgery/ˈfɔːdʒəri/n شێواندن- ساختەکاری
forget/fəˈget/v لە بیر دەکا- لە بیری نامێنێ
وەبیری نایەتەوە، فەرامۆش دەکا- خۆی لە بیر دەکا
forgive/fəˈɡɪv/v لێی دەبورێ، دەیبەخشێ لێیخۆش دەبێ
forgo/fɔːˈɡəu/v وازدێنێ، دەست بەردار دەبێ
fork/fɔːk/n ١- چەنگاڵ، ژەتاڵ
٢- دووریان
forlorn/fəˈlɔːn/adj ١-کلۆڵ، بێسەرپەرشت ٢-چۆڵ و هۆل
form/fɔːm/n ١- شێوە ٢- شێوەی (کتێب)
٣- فۆرم ٤- پۆل ٥- دارشتن
٦- لەش سووکی ٧- تۆماری ئێستا
form/v ١- پێکدێنێ
٢- ئەم شێوەیە وەردەگرێ
formal/ˈfɔːml/adj ١- میری- ڕەسمی
٢- زانکۆیی- قوتابخانەیی
formality/fɔːˈmæləti/n ڕێ و ڕەسم، شتی هەروا
format/ˈfɔːmæt/n - v شێوە
formation/fɔːˈmeɪʃn/n ١- پێکهێنان
٢- کۆمەڵەیەك
formative/ˈfɔːmətɪv/adj کاریگەرێکی زۆری هەیە
former/ˈfɔːmə(r)/adj ١- پێشوو
٢- یەکەم لە
formerly/adv لە ڕابردوو

foil/fɔɪl/v وادەکا فەشەل بێنێ-
ناهێلێ کارەکە تەواو بکا
foist/fɔɪst/v زۆری لێدەکا کە کارێ
بکەی بەدڵت نەبێ/ هەڵیدەخەڵەتێنێ
fold/fəʊld/v - n ١- دەیچەمێنێتەوە
٢- دەیچێتە ناو یەك ٣- رانەگری، دادەخا
٤- چەماوە، قۆپاوە
folder/ˈfəʊldə(r)/n ١- کاغەز هەڵگر
٢- دۆسیە
foliage/ˈfəʊliɪdʒ/n گەڵاکانی دار یان روەك
folk/fəʊk/n ١- خەڵك
٢- کۆمەڵە کەسێکی تایبەت لەخەڵك وەك
خەڵکی دێ.
٣- خزم و کەس خۆیش ٤- میللی
folklore/ˈfəʊklɔː(r)/n فۆلکلۆر
follow/ˈfɒləʊ/v ٢- بە دوای دەکەوێ
(تا بیگری) ٢- بەهەمان ئاراستە دەروا
٣- شوێن پێی هەڵدەگرێ ٤- قەبول دەکا
٥- چاودێری دەکا، گوێی لێ دەگرێ
٦- خۆشی دەبینێ لە... ٧- روودەدا لە ئاکامی
٨- وەك ئەخشەی بۆکێشراوبو روودەدا
as follows وەك خوارەوە
folly/ˈfɒli/n گەمژایەتی، گەلحۆیەتی
fond/fɒnd/adj ١- شەیدا ٢- نەرم و
خۆشەویست ٣- ئالودە
fondle/ˈfɒndl/v دەست دەکاتە شتێ
بە نەرمی - دەیلاوێنێتەوە - ئالودەی دەبێ
food/fuːd/n ١- خواردن ٢- خۆراك
food poisoning/n ژەهراوی بوونی
خواردن-خۆراك
fool/fuːl/n - v گەلحۆ، گەمژە: گێژی،
شێتی
بۆتە قەشمەرجار- فێلی لێ دەکا
کڵاوی لە سەردەنێ/دەنێن
foolish/ˈfuːlɪʃ/adj گەلحۆ، گەمژە، بێ ئاقڵ،
شێت
foolproof/ˈfuːlpruːf/adj بێ‌هەڵە، ورد

foot/fʊt/n ١- لاق- قاچ
٢- ئەوەندەی گۆرییە دەیگاتێ
٣- پێ(قەدەم) ٤- بنی- شتێ
٥- ژێرەوەی سەرێن- جێگای نوستن
footprint/ˈfʊtprɪnt/n شوێن پێ، جێ‌پێ
footstep/ˈfʊtstep/n هەنگاو- شەقاو
footwear/ˈfʊtweə(r)/n پێلاو- پۆتین
foot the bill/v حیساب دەدا، پارەدەدا
football/ˈfʊtbɔːl/: soccer/n فتبۆڵ
١- یاری تۆپی پێ/تۆپانێ
٢- تۆپی یاری تۆپی پێ
footballer/ˈfʊtbɔːlə(r)/n یاریکەری
تۆپی پێ
football pools/n یانسیبی تۆپانێ
foothold/ˈfʊthəʊld/n شوێن پێ
footing/ˈfʊtɪŋ/n ١- پێ گرتن لەسەر زەوی
خۆراگرتن لە سەر زەوی- بە پێ وەستان
٢- ئاست و پلەو پایە
footnote/ˈfʊtnəʊt/n پەراوێز دەمەمن
footpath/ˈfʊtpɑːθ/n رێچکە، تولە رێ
for/fə(r)/prep - conj ١- بۆ
٢- بۆ مەبەستی ٣- بەرەو ٤- بۆ- تایبەت بە..
٥- بۆ (خۆت)٦- بە (نرخ)٧- بە هۆی
٨- بە بۆنەی ٩- بۆ/لایەنگری ١٠- وەك نوێنەر-
لەجیاتی١١- دەنوێنێ ١٢- بۆئەوەی
١٣- سەبارەت بە١٤- پاش ١٥- بەرامبەر
١٦- بۆماوەی ١٧- لە(کاتی‌دیاریکراو)
١٨- ماوە ١٩- وێڕای ئەوەی٢٠- هەتاهەتایی
٢١- چونکە
forbid/fəˈbɪd/v ١- ناهێڵێ ٢- رێ نادا
force/fɔːs/n ١- هێزی فیزیکی
٢- دەسەڵات- کاریگەری
٣- دەوڵەت- هەڵبەندی دەسەڵات
٤- هێزە ٥- هێزی (با) ٦- کۆمەڵی راهێنراو
in force بەکۆمەڵ، بە ژمارەیەکی زۆر
force/v ١- زۆری لێ دەکا- ناچاری دەکا
٢- خورتی لێ دەکا

دەبوژێتەوە
٢- (دەست) رادەوەشێنێ بۆ ئاگاداری
٣- جولەی سەرنج راکێش

**flout/flaʊt/v** ١-گاڵتەی پێ دەکا
٢-یاخی دەبێ، رەد دەکاتەوە

**flow/fləʊ/v** ١- ئیشاو دەکا
٢-دوا دەکەوێ ٣-هەڵدەقولێ

**flower/ˈflaʊə(r)/n - v** گوڵ، گوڵ دێنێ، گوڵ دەردەکا

**flowery/ˈflaʊəri/adj** بەگوڵ رازاوە

**flower-bed/n** ئەستێرکی گوڵ، باخچەی گوڵ

**flower pot/ˈflaʊəpɒt/n** گوڵدان

**flu/flu:/n** هەڵامەت، پەستیو

**flu birds** هەڵامەتی تەیرو تواڵ

**fluctuate/ˈflʌtʃueɪt/v** ١-شەپۆل دەدا
٢-زوو دەگۆڕێ لە ... بۆ

**fluent/ˈflu:ənt/adj** زمان پاراو، رەوان

**fluency/ˈflu:ənsi/n** رەوانی، زمان پاراوی

**fluently/adv** بە رەوانی، بە زمان پاراوی

**fluff/flʌf/n** خلت، ماددەیەکی نەرمە لە بەتانیا وشتی دێ دێت.

**fluid/ˈflu:ɪd/n** شلە

**fluke/flu:k/n** ١-رێکەوت ٢-بەخت

**fluorescent/flɔ:ˈresnt/adj** روناکی نیۆن، گەشاوە، بریقەدار

**fluoride/ˈflɔəʊraɪd/n** فلۆرید

**flurry/ˈflʌri/n** باران، بەفری کەمی لە ناکاو

**flush/flʌʃ/v** ١-لە شەرما ڕووی سور دەبێ
٢-خوێن لەرووەمەتی دەچزێ- ڕووی‌سوور‌دەبێ
٣-سیفۆن ئێدەدا بۆ پاقژکردنەوەی ئاودەشت
٤-بە ئاوێکی بە ئیشاو ... پاقژ دەکاتەوە.

**flush/adj** ڕاست- ئاست

**flush/n** ١-پۆکەر- خونچە
٢- سور هەڵگەران

**fluster/ˈflʌstə(r)/v** توڕەی دەکا، سەری لێ دەشێوێنێ- سەر خۆش دەبێ

**flute/flu:t/n** فلوت

**flutist/ˈflu:tɪst/n** فلوت ئێدەر

**flutter/ˈflʌtə(r)/v - n** ١-بەرەو سەرەوەو خوارەوە دەجولێتەوە/ دەشەکێتەوە
٢-سەما دەکا لە هەوا
٣-دڵی ... بە توندی ئێدەدا

**flux/flʌks/n** گۆڕانێکی بەردەوام

**fly/flaɪ/v** ١- دەفڕێ ٢- بە فڕۆکە دەفڕێ
٣- فڕۆکە ئێدەخوڕێ ٤- بەسەر ناوچەیەك دەفڕێ ٥- بە خێرا و لە ناکاو دەردەپەڕێ
٦- زوو تێ دەپەڕێ ٧- دەشەکێتەوە

**fly off the handle** لە توڕەییا دەتەقێتەوە

**at fly** بە توڕەیی هاوار دەکا

**fly/n** مێش

**fly/n** زنجیری پێشەوەی پانتلۆن

**flying/ˈflaɪɪŋ/n** فڕین

**flyover: overpass/n** ئۆڤەر پاس، پردی بەرز- ئاسمانی

**foal/fəʊl/n** جوانو، بەچکەی ئەسپ

**foam/fəʊm/n - v** ١- کەف
٢-سابونی ریش تاشین
٣-ئیسفەنجی پلاستیکی ٤-کەف دەکا

**fob/fɒb/v-n** ١-فێڵی لێ دەکا
٢-لە کۆڵ خۆی دەکاتەوە
٣-لە گیرفانی سەعاتی دادەنێ

**focal point/n** خاڵی جەخت، خاڵی گرنگ

**focus/ˈfəʊkəs/n - v** ١- چەق
٢- ناوەندی گرنگی، جەخت کردن
٣- ئاراستە دەکا
٤- سورە لەسەر، رژدە لەسەر

**fodder/ˈfɒdə(r)/n** ئالیك، کا

**foe/fəʊ/n** دوژمن- نەیار

**foetus: fetus/ˈfi:təs/n** کۆرپەلە

**fog/fɒg/n** ١- تەم- تەمتومان
٢- ماوەی تەم

**foggy/ˈfɒgi/adj** تەماوی

**foil/fɔɪl/n** ١-کانزای ئەلەمنیومی، شیر
٢-دەپەشۆکێ

fleet/fli:t/n ١- کەشتی گەل
٢- کاروان
flesh/fleʃ/n گۆشتی مرۆڤ ٢- کاکل
flex/fleks/n وایەری کارەبایی ناو پلاستیك
flex/v راهێنان دەکا-دەقەچینێتەوە
flexible/ˈfleksəbl/adj ١- نەرم- شل
٢- توانای گونجانی هەیە
flick/flɪk/v ١- بەخێرا دەجولێتەوە
٢- لێدانێکی هێدی-سوك-ی لێ دەدا
flicker/ˈflɪkə(r)/n بە کزی دەسوتێ-
ئەم سەرو ئەو سەر دەکا
flight/flaɪt/n ١- فرین ٢- کەشتی ئاسمانی
٣- کەشتێکی ئاسمانی دیارکراو
٤- کۆمەڵە پەیژەیەك
flight/n هەڵاتن- راکردن
flimsy/flɪmzi/adj ١- ئاسك
٢- لاواز٣- لاواز- هیچ نا
flinch/flɪntʃ/v ١- بەرەو پاشەوە دەکشێتەوە
٢- دوور دەکەوێتەوە ٣- دەسڵەمێتەوە
fling/flɪŋ/v ١-فڕێ دەدا ٢-دەمەژێتەوە
fling/n ١-هاویشتن ٢-ماوەیەکی کورتی
خۆش رابواردن
flint/flɪnt/n ١- بەردی بریسکەدەر
پروشکدەر ٢- بەردی چەرخ
٣-بەردە ئەستێ
flip/flɪp/v ١- زوو دەکۆرێ
٢- پارە بۆ ئاسمان فڕ دەدا تابزانێ کێ یەکەم
جار دەست پێدەکا (شێرو خەتتێن دەکا)
٣- هەڵدەچێ و تورە دەبێ
flippant/ˈflɪpənt/adj ١-دەمڕوت
٢-زۆر بڵێ- زۆرەو
flipper/ˈflɪpə(r)/n پەڕ- باڵ
flipping/ˈflɪpɪŋ/adj - adv دار گران،
ئێسقە گران
flirt/flɜ:t/v مغازەڵەی دەکا، پیا هەڵدەدا
flit/flɪt/v ١-دەفڕێ ٢-کز دەبێ
٣-زوو ون دەبێ

float/fləʊt/v ١- سەر ئاودەکەوێ
٢- دەوەرێ، لە ئاسمان مەلە دەکا
٣- نەچەسپاو
float/n ١-چووپ بۆ فێر کردنی مەلەوانی
٢-گالیسکە
flock/flɒk/n-v ١-مێگەل- جەلەب
٢- ڕەوە باڵندە
٣- ئاپورە دەکەن، حەسامەت پێك دێنن
flog/flɒg/v ١- دەفرۆشێ ٢- بە قامچی
لێی دەدا
flogging/flɒgɪŋ/n دارکاری کردن
جەڵدەدان
flood/flʌd/v ١- پڕ ئاو دەبێ-
لافاو دایدەگرێ ٢- بەسەریدا دەباری
flood/flʌd/n لافاو
floor/flɔ:(r)/n ١-زەوی ژوور
٢-ڕووی بنی دەریا ٣-نهۆم
floor/v ١-ئاو ژوورەکە دادەرێژێ
٢-توشی سەرسوڕمانی دەکا-
سەری سوڕ دەمێنێ
flop/flɒp/v - n ١- هیلاك دەبێ-
بەزەحمەت رێ دەکا
٢- بەسەر ڕووخساریا دێتە خوارێ
٣- ڕۆیشتنی بەزەحمەت- لەبەر هیلاکی
٤- هەوڵی سەرنەگرتو، سەرنەکەوتن
flora/ˈflɔ:rə/n فلۆرا، ڕوەکی
ناوچەیەکی تایبەت
floral/ˈflɔ:rəl/adj بە گوڵ رازاوە
florist/ˈflɒrɪst/n گوڵ فرۆش
flounder/ˈflaʊndə(r)/v ١-لەناو ئاو
(شەپەشەپ دەکا)- بەگرانی‌دەڕوا
٢- پرتەپرت دەکا، قسەی رێکی پێ ناکرێ
٣- ماسی دەریا
flour/ˈflaʊə(r)/n ئارد- هەویر
flourish/ˈflʌrɪʃ/v ١- گەشە دەکا،

**flabby/ˈflæbi/adj** ١- گۆشتی زۆر نەرمە
٢- نەرم- خاو
**flag/flæg/n** ئالا- پەیداخ
**flag/v** ١-ماندو دەبێ، خاو دەبێ
٢-ئالا هەڵدەکا
**flagrant/ˈfleɪgrənt/adj** حەیابەر،ئابڕووبەر
**flail/fleɪl/v** ١-دەمەڕێ، ڕادەوەشێ
٢-دەدوڕێتەوە
**flair/fleə(r)/n** ١- توانای سروشتی
٢- بەهرەیەکی سروشتی
**flak/flæk/n** ١- ئاگری تفەنگ و تۆپ
٢- ڕەخنەی توند
**flake/fleɪk/n** پارچە بەفر- کڵۆی بەفر
**flake/v** تفر هەڵدەدا
**flamboyant/flæmˈbɔɪənt/adj**
١-زیدە ٢-شەنگی
**flame/fleɪm/n** گوڕزە ئاگر
گوڕزە ڕوناکی، گڕ، ژیلە مۆ
**flaming/adj** ١- گڕگرتو
٢- زۆر ڕوناك- تریسکەدار، شەوقدار
٣- توند- تیژ ٤- پیس، نەفرەت لێکراو
**flammable/ˈflæməbl/adj** زوو گڕ دەگری
**flan/flæn/n** پەپکە نان- گژنیش/کولیچە
**flank/flæŋk/n** لاکەلەك- ئاو قەد
**flannel/ˈflænl/n** فانیلا
**flap/flæp/n** قەپاغ/پۆشەر
**flap/v** ١-سەرو بنی پێ دەکا
٢-نیگەران دەبێ ٣-دەشەکێتەوە
**flare/fleə(r)/v** ١- لە پڕ گڕ دەگرێ
٢- گڕ دەگری(لە توڕەییا)
**flash/flæʃ/n** ١- تیشك
٢- توانای لە ئاگاو ٣- فلاش
**flash/v** ١- خێرا تیشك دەنێرێ
٢- خێرا تێدەپەڕێ ٣- خێرا پیشاندەدا
٤- نیگایەکی تایبەتی بۆ دەنێرێ
٥- بروسکە هەواڵ دەنێرێ
٦- ڕابردووی وەبیر دێنێتەوە
٧- گەڕانەوەیەکی خێرا بۆ ڕابردوو
**flask/flɑ:sk/n** ١- کەمۆڵە ، بۆتڵی مل باریك
٢- بوتڵی ئارەقی بچوکی گیرفانی
**flat/flæt/adj - n** ڕاست- دەشت- شوقە
١- دەشت- ڕاستایی ٢- ڕاست- بێ پاژنە
٣- بێ هەوا ٤- خامۆش
٥- خواردنەوەی بێ بلق (چونکە کاتی بەسەر چووە) ٦- ئەکارکەوتوە ٧- نەوی، نزم
٨-نزمتر لە..٩- یەکلاکەرەوە
١٠- نەگۆڕ، دیاریکراو
**flat/adv** ١- لەسەر زگ-سك- کەوتوو
٢- نزمتر لە..
٣- لە کاتی دیاریکراو- بەتەواوی
**fall flat** بێ کاریگەر- سارد
**flat/n** ١- نیشانەی نزمی
٢- ڕاستایی٢- تایەی بێ‌هەوا
**flatter/ˈflætə(r)/v** ١- مامە حەمەیی /
ماستاوچییەتی دەکا٢- لە خۆ ڕازی
٣- زیدە ڕەوی لە ستایشی خۆی دەکا
**flattery/ˈflætəri/adj** ماستاوچییەتی/
مامەحەمەیی
**flaunt/flɔ:nt/v** شانازی پێ دەکا
**flautist/ˈflɔ:tɪst/n** فلوت ژەن
**flavour/ˈfleɪvə(r)/n** ١- تام
٢- جۆری تایبەتی...
**flaw/flɔ:/n** ١- خەوش ٢- هەڵە، کێماسی
٣- سیمایەکی خراپ لە کە سایەتی...
**flawless/ˈflɔ:ləs/adj** بێ خەوش
**flawed/adj** بە خەوش
**flax/flæks/n** ١- ڕوەکی کتان٢- داوی کتان
**flea/fli:/n** کێچ
**fleck/ˈflek/n** خاڵ/نیشانە
**flee/fli:/v** هەڵدێ- ڕادەکا
**fleece/fli:s/n** ١- خوری مەڕ یان بزن
٢- قوماشی وەك خوری مەڕ

٣- کۆمەڵێ پرسیاری بەسەر دەبارێنێ
٤- دەوروژێنێ

firing squad/n تیمی گوللەباران کردن

firework/ˈfaɪəwɜ:k/n ئاگربازی- وازی- بە ئاگر

firm/fɜ:m/n کۆمپانیا

firm/adj ١-خۆگر
٢- نەگۆڕ، چەسپاو ٣- سوور، ڕشت

first/fɜ:st/det یەکەم

first aid/n فریاگوزاری

first class/n ١- نایاب ٢- پلە یەك

first floor/n ١- نهۆمی یەکەم
٢- نهۆمی خوارەوە

first name/n ناوی یەکەم (ناوی مرۆڤ کە باوك و دایك لە منداڵ دەنێن)

first rate/adj باشترین جۆر، جۆری نایاب

first/adv ١- پێش هەرشتێکی تر
٢- پێش هەموو شتێ٣- بۆ یەکەم جار
٤- لەبەراییدا، لەسەرەتادا ٥- یەکەم لە(لیست)

at first لە بەراییدا

come first بەپلە یەك دێت

first and foremost یەکەم و پێش هەمووشتێ

first of all پێش هەموو شتێ

first/n ١- یەکەم کەس
٢- گرنگترین ڕوداو کە بۆ یەکەم جار ...
٣- پلەی نایاب لە زانکۆ

firsthand/ˌfɜ:sthænd/adj - adv ڕاستەوخۆ، یەکسەر

fish/fɪʃ/n ١- ماسی ٢- گۆشتی ماسی

fishy/ˈfɪʃi/adj ١- وەك ماسی لە بۆن و تام ٢- جێی گومان

fish and chips/n ماسی و پەتاتە

fish finger: fish stick/n پەنجەماسی

fishmonger/ˈfɪʃmʌŋgə(r)/n ماسی فرۆش

fish/v ١- ماسی دەگرێ لە دەریا

fisherman/ˈfɪʃəmən/n ماسی گر

fishing/ˈfɪʃɪŋ/n ماسی گرتن

fist/fɪst/n مست

fit/fɪt/adj ١- شیاو- گونجاو- لەبار
٢- تەندروستی جەستەیی باشە

fitness/ˈfɪtnəs/n تەندروستی جەستەیی

fit/v ١-دەگونجێ
٢- شوێنێکی (شیاو) دەدۆزێتەوە
٣- لە جێی خۆی دادەنێ٤- دەسازێنێ

fit/n سازان- گونجان / فێ گرتن - گەشکە

fit/v ١- خۆگرتن- گەشکە دەگرێ / فێ گرتن
٢- نەخۆشی لە پڕ/لەناکاو

fitting/ˈfɪtɪŋ/adj شیاو

fitting/n کەلو پەلی ناو ماڵ

five/faɪv/number پێنج

fiver/ˈfaɪvə(r)/n پێنجی

fix/fɪks/v ١- دەبەستێ- گرێ دەدا
٢- دەچەسپێنێ، دیاریدەکا ٣- چاکدەکاتەوە
٤- ئاکامەکە پێشتر دەزانێ
٥- خواردن و خواردنەوە ئامادە دەکا

fixed/fɪkst/adj ١- دیارکراو
٢- چەسپاو- نەگۆڕ

fix/n ١- ئارێشە، قەیران
٢- دەرزی بێهۆشکەر

fixation/fɪkˈseɪʃn/n هەستێکی زۆر توند و نائاسایی

fixture/ˈfɪkstʃə(r)/n ١- پارچەی کەلوپەلی ناو ماڵ
٢- ژوانی دیارکراوی ڕوداوێکی وەرزشی

fizz/fɪz/v بڵق دەکا، هەڵدەچێ

fizzy/ˈfɪzi/adj بڵقدار

fizzle out کۆتایی باش نابێ، بێ‌ئومێد دەبێ، خراپ دەبێ

flabbergasted/ˈflæbəgɑ:stɪd/adj سەرشێواو، واق وڕماو

fill/fɪl/v ١- پڕدەکاتەوە، دەتاخنێ
٢- ئەو پۆستەی هەبوو گیرا- کەسێ قەبوڵ کرا
filling/ˈfɪlɪŋ/n ئاخنین، پڕکردن
fillet/ˈfɪlɪt/n ١-پێچە
٢- نەرمک (نەرمەی گۆشت)
film/fɪlm/n - v ١- فیلم٢- فیلمی وێنە گرتن
film star/n ئەستێرەی سینەمایی
filter/ˈfɪltə(r)/n - v پاڵێو/فیلتەر-دەپاڵێوێ
filth/fɪlθ/n ١-پیسی ٢-وشەی وێنەی بێ ئەدەب ٣-قرێژ
filthy/ˈfɪlθi/adj ١- پیس٢- بێ ئەدەب
fin/fɪn/n باڵی ماسی- پەڕی ماسی
final/ˈfaɪnl/adj - n ١- دوا٢- کۆتایی
٣- یاری کۆتایی
٤- تاقیکردنەوەی کۆتایی- پێش دەرچوون
finalist/ˈfaɪnəlɪst/n بەشدار لە یاری کۆتایی
finalize/ˈfaɪnəlaɪz/v کۆتایی پێ دێنێ
finale/fɪˈnɑːli/n کۆتایی- دوابەش (پارچە مۆسیقا)
finally/ˈfaɪnəli/adv لە کۆتاییدا
finance/ˈfaɪnæns/n - v ١- دارایی٢- پارە
٣- حاڵەتی دارایی- پارە دەدا- خەرجی دەخاتە ئەستۆی خۆی
financial/faɪˈnænʃl/adj دارایی
finch/fɪntʃ/n باڵندەیەکی بچووک دەنووک بەهێز
find/faɪnd/v - n ١- دەدۆزێتەوە (شتی ونبوو) ٢- دەدۆزێتەوە
٣- شتێ بە رێککەوت دەدۆزرێتەوە
finder/ˈfaɪndə(r)/n دۆزەرەوە
fine/faɪn/adj ١- جۆری باش
٢- هێندە باش ٣- تەندروستی باش ٤- خۆش
٥- ورد- نەرم ٦- ورد، هوردە ٧- زۆر ورد
fine/n پێ بژاردن، سزا
finger/ˈfɪŋgə(r)/n - v پەنجەی دەست
پەنجەی لێ دەدا
fingernail/ˈfɪŋgəneɪl/n نینۆک
finger print/ˈfɪŋgəprɪnt/n پەنجەمۆر
finish/ˈfɪnɪʃ/v ١- کۆتایی پێ دێنێ
٢- دەخوا، دەخواتەوە هەتا کۆتایی- کۆتایی
بەخواردن و خواردنەوە دێنێ ٣- تەواو دەکا
finish off/n دەکوژێ
finish with/n ١- وازدێنێ لە
٢- پەیوەندی دەپچڕێنێ
finish/n ١- کۆتایی (یاری)
٢- پۆلیش کردن
finite/adj ١-دیاریکراو-سنووردراو
٢-فرمانی تەواو
Finn/adj فنلەندی
fiord: fjord/ˈfiːɔːd/n کەنداوێکی
تەسکی درێژ (لەنەرویج)
fire/ˈfaɪə(r)/n - v ١- ئاگر٢- سوتان
٣- ئاگر (داری خەڵوز سوتاو- بۆ خۆ گەرم
کردنەوە) ٤- سۆبە
٥- گوللە تەقاندن- گوللە- فیشەک- هاوێژتن
firearm/ˈfaɪərɑːm/n چەکی ئاگری-
چەک کلاشینکۆف
fire brigade/n تیمی ئاگرکوژێنەوە
fire engine/n ئۆتۆمبێلی ئاگر کوژێنەوە
fire escape/n پەیژەی-قادرمەی-
خۆرزگارکردن لەئاگر
fire extinguisher/n ئاگر کوژێنەوە
fire fighter: fireman/n
پیاوی ئاگر کوژێنەوە
fire place/ˈfaɪəpleɪs/n ئاگردان
fire side/ˈfaɪəsaɪd/n تەنیشت ئاگردان
fire station/n مەڵبەندی ئاگر کوژاندنەوە
fire wood/n داری سوتان
fire/v ١- گوللە دەتەقێنێ- گوللە لە...دەگرێ
٢- لە کار دەری دەکا- دەردەکرێ

feudal/ˈfju:dl/adj دەرەبەگ– دەرەبەگی
feudalism/ˈfju:dəlɪzəm/n دەرەبەگایەتی
fever/ˈfi:və(r)/n ١– تا ٢– هەلچوون– توڕەیی
few/fju:/det - adj کەم
few and far between دەگمەن
few/det ژمارەیەکی کەم، هەندێك
a good few/quite a few گەلێك
fiance/fiˈɒnseɪ/fiancee دەسگیر دەسگیران بۆ کچ/بۆ کوڕ
fiasco/fiˈæskəʊ/n بەزین
fib/fɪb/n - v درۆی سپی و مەسلەحەت– درۆ دەکا
fibre/ˈfaɪbə(r)/n ١– ریشاڵ٢– چنراو
fickle/ˈfɪkl/adj بێ بار
fiction/ˈfɪkʃn/n چیرۆك– ڕۆمان، خەیاڵئامێز
fictional/ˈfɪkʃənl/adj خەیاڵی
fiddle/ˈfɪdl/n ١– کاری ناپەسند(دزین) ٢– کەمان– کەمانچە
fiddle/v ١–خۆی مژوڵ دەکا ٢– ساختە دەکا ٣–کەمانچە دەژەنێ
fidelity/fɪˈdeləti/n ١–پاکێتی– دڵسۆزی ٢–وردی
fidget/ˈfɪdʒɪt/v بەبێزاری و توڕەیی دەجوڵێتەوە
field/fi:ld/n ١– کێلگە ٢– گۆڕەپان٣– کان٤– بوار
fieldwork/ˈfi:ldwɜ:k/n کاری بواری (دەرەوە)
field/v ١– تۆپ دەگرێ و دەهاوێژێ ٢– تیمێك هەڵدەبژێرێ بۆ یاری کردن
fiend/fi:nd/n ١– شەیتان– ئەهریمەن– تاغوت ٢– کەسێ کە بە ئاناسایی کەیفی بەشتێ دێ
fiendish/adj ١– شەیتانی– دڕ ٢– پلانێکی جەمەنەمی– زیرەکانە
fierce/fɪəs/adj ١–دڕ ٢– زیانگەیەنەر
fiery/ˈfaɪəri/adj ١–ئاگری– وەك ئاگر ٢–تیژ
fifteen/ˌfɪfˈti:n/number پازدە
fifteenth/ˌfɪfˈti:nθ/pron, det, adv پازدەهەم
fifth/fɪfθ/pron, det, adv پێنجەم
fifty/ˈfɪfti/number پەنجا
fifty fifty/adj پەنجا بە پەنجا/نیوە بەنیوە
fig/fɪg/n هەنجیر– داری هەنجیر
fight/faɪt/v ١– شەڕدەکا– دەجەنگێ ٢– (ئاگر) دەکوژێنێتەوە، لە دژی (تاوان) دەجەنگێ٣– خەبات دەکا، تێدەکۆشێ ٤– ململانێ دەکا
fighter/ˈfaɪtə(r)/n ١– شەڕکەر، جەنگاوەر ٢– فڕۆکەی شەڕ
fighting/ˈfaɪtɪŋ/n شەڕ، جەنگ
fight/n ١– شەڕ، جەنگ ٢– ئارەزوی ململانێ و شەڕ
figurative/ˈfɪgərətɪv/adj مەجازی ، خوازراو
figure/ˈfɪgə(r)/n ١– ژمارە٢– نرخ ٣– کەس (جوان دیار نەبێ) ٤– کەس لە وێنە ٥– جەستە، بەژن ٦– کەسایەتی، کەسی ناسراو ٧– دایەگرام٨– حیساب
figures of speech/n مەجازیەت، خوازراو
figure/v ١– دەچێتە ناو ٢– دەخەمڵێنێ، وازەن دەبری
file/faɪl/n-v ١–فایل ٢–دۆسیە ٣– هەڵگیراو لە ٤– پارێزراو لە فایل ٥– دەپۆلێنێ ٦– لە فایل دادەنێ
file/v بڕەم (ئینۆك) دەکا، دار دەبڕێ– ڕێك دەخا
file/v یەك لەدوای یەك، سرە– سرە دەگرێ

٥- وادەزانی، باوەڕی وایە ٦- ئازار دەچێژێ

٧- خەیاڵ دەکا، بە خەیاڵی دێ

٨- هەوڵدەدا شتێ بدۆزێتەوە بەدەست لێدەدا

feel/n ١- هەست- ئەست

٢- دەست لێدان

feelers/ˈfiːləz/n ١- هەستیار

٢-پێشنیار

feeling/ˈfiːlɪŋ/n ١-هەست ٢-هەست-سۆز

٣- توانای هەستکردن

٤- تێگەیشتن- لەیەك گەیشتن

feline/ˈfiːlaɪn/adj ١-پشیلە ئاسا

٢-فێڵباز

fell/fel/v کەوت

fell/n ١-ناوچەی چیایی

٢-پێستی گیانەوەر ٣- موو- سووف

fell/v دار دەبڕێ

fellow/ˈfeləʊ/n ١- پیاو ٢- هاوڕێ

٣- مرۆ

fellow/adj هاوڕێ- هاوپیشە

fellowship/ˈfeləʊʃɪp/n ١- برایەتی، هاوڕێیەتی ٢- کۆمەڵەیەك، کۆمەڵێ

٣- پۆستێکی زانکۆیی

felt/felt/v هەستی کرد

felt/n لباد

female/ˈfiːmeɪl/adj ١- مێ/مێینە

٢- بەرهەمدار

feminine/ˈfemənɪn/adj ١- مێ یەتی

٢- مێ ٣- ڕەگەز- زایەند

femininity/ˌfeməˈnɪnəti/n مێیەتی

feminism/ˈfemənɪzəm/n فێمینیزم

لایەنگر برائی- فێمینیست

feminist/ˈfemənɪst/n

مێیایەتی/ یەکسانخواز

fen/fen/n ١-زۆلکاو ٢-دراوی چینی

fence/fens/n-v سیاج-

دیواری دەرەوە/شورە/پەرژین

شورەبەند- دیوار دروست دەکا/

پەرژین دروست دەکا

fencing/n وەرزشی شەڕەشیر

fend/fend/v ١- ئاگای لەخۆدەبێ

٢- داکۆکی لەخۆیدەکا

fender/ˈfendə(r)/n-v ١- ئەمپەر/

ڕێگری ئاگرو خەلوز

پارچە کانزایەکە وەك ڕێگرێك بەکاردێت

٢- سەروی تایەی ئۆتۆمبیل دادەپۆشێ

ferment/fəˈment/v - n ١-دەترشێ

دەترشێنێ ٢-هەڵچوون ٣-هەوێن

ferocious/fəˈrəʊʃəs/adj کێوی و درندە

ferociously/adv درندانە

ferocity/fəˈrɒsəti/n درندەیی

ferret/ˈferɪt/n گیانەوەرێکی

درندەی بچوکە ڕاوی جورج و کەرویشکی پێ

دەکرێ

fertile/ˈfɜːtaɪl/adj ١- بەپیت ٢- داهێنەر

fertility/fəˈtɪləti/n بە پیتی

fertilize/ˈfɜːtəlaɪz/v ١- دەپیتێنێ

٢- پەیین دەکا

fertilization/ˌfɜːtəlaɪˈzeɪʃn/n-پیتاندن

پەیین کردن

fertilizer/ˈfɜːtəlaɪzə(r)/n سەماد- پەیین

fervent/ˈfɜːvənt/adj شەیدا، بەپەرۆش

fervour/ˈfɜːvə(r)/n حەماسەت، پەرۆشی

fester/ˈfestə(r)/v (برینەکە)کێمی دەبێ-

(ڕەوشەکە)بەئازارتر دەبێ

festival/ˈfestɪvl/n ١- جەژن، فیستیڤاڵ

٢- ئاهەنگ

festive/ˈfestɪv/adj کەیف خۆش، شاد

festivity/feˈstɪvəti/n ١- کەیف خۆشی ، شادی ٢- جەژن

fetch/fetʃ/v ١- دەچێ و دێنێ ٢- دەفرۆشرێ

fete/feɪt/n ئاهەنگ- بەزم

fetus: foetus/n کۆرپەلە- ئاولەمە

feud/fjuːd/n-v دوژمنداری/دوژمنداریدەکا

fatality/fəˈtæləti/n قوربانی، کوژراو
fate/feɪt/n ١- قەزاو قەدەر ٢- چارەنووس
fateful/ˈfeɪtfl/adj ١-گرنگ و یەکلاکەرەوە ٢- چارەنووسساز
father/ˈfɑːðə(r)/n ١- باوك ٢- باوك- داهێنەر ٣- باوك: باوکی رۆحی- لەقەبی دینی ٤- باوکێتی
fatherly/adj باوکانە
Father Christmas Santa Claus بابانوێل
father-in-law/n خەزوور
fathom/ˈfæθəm/n ١-رێکخەری قولایی- قولایی شەش پێ ٢-تێ گەیشتن
fatigue/fəˈtiːg/n هیلاکی- شەکەتی- شەکەتبوون
faucet: tap حەنەفییە، بەلوعە، شێرە
fault/fɔːlt/n - v ١- کێماسی- کەم وکورتی ٢- غەلەت، گوناه ٣- هەلە- غەلەت دەبینێتەوە لە..
faultless/ˈfɔːltləs/adj بێ عەیب، بێ کەم و کورتی
faulty/ˈfɔːlti/adj عەیبدار، بە خەوش، خەوشدار
faux pas/ˈfəʊ ˈpɑː/n لە دەم دەرچوو، هەڵەی زمان
favour/ˈfeɪvə(r)/n ١- چاکە ٢- رازی بوون- قایل بوون
favour/n - v ١- لایەنگری دەکا- پشتگیریدەکا ٢- تەحەیز دەکا ٣- پەسەند دەکا
favourable/ˈfeɪvərəbl/adj گونجاو- شیاو- لە بار
favourite/ˈfeɪvərɪt/adj - n پەسند
favouritism/ˈfeɪvərɪtɪzəm/n مەحسوبیەت/ لایەنگرخوازی
fawn/fɔːn/adj - n ١-ئاسکی بچوك- بێچوی ئاسك ٢- رەنگی قاوەیی زەردباو

fax/fæks/n - v ١- فاکس ٢- ئامێری فاکس٣- فاکس دەنێرێ
faze/feɪz/v نیگەران دەکا
fear/fɪə(r)/n ١-ترس ٢- ترساو
fearful/ˈfɪəfl/adj ١-ترسنۆك ٢-تۆقێنەر
fearless/ˈfɪələs/adj جەسوور، نەترس
fear/v ١- دەترسێ لە ٢- دەترسێ .. پەروا
feasible/adj پیادەدەکرێ/ئەنجام دەدرێ
feast/fiːst/n - v ١-مێوانداری- جەژن مێوانداری دەکا ٢-جەژنی دینی
feat/fiːt/n کارێکی جوامێرانە
feather/ˈfeðə(r)/n پەڕ، پەڕەموچکە
feature/ˈfiːtʃə(r)/n - v ١- ئەدگار سیما ٢- بەشێکی دەموچاو ٣- وتارێکی رۆژنامەیی گرنگ ٤- فیلمی سەرەکی ٥- لە خۆدەگرێ ٦- رۆڵێکی گرنگ دەبینێ
featureless/adj بێ کەسایەتی، بێ ئەدگار
February/ˈfebruəri/n مانگی شوبات
federal/ˈfedərəl/adj ١-فیدرالی- یەکێتی ٢- فیدرالی- نەك دەوڵەت
federation/ˌfedəˈreɪʃn/n فیدرالییەت
fed up/ˌfed ˈʌp/adj شەکەت، ماندو، بێزار
fee/fiː/n ١- هەق، کرێ، هەقدەست ٢- ئابوونە
feeble/ˈfiːbl /adj ١- لاواز بێ تاقەت ٢- نەڕازی کەر، نەقایلکەر
feed/fiːd/v – n ١- دەرخواردی دەدا، نانی دەدانێ ٢- خواردنی دەداتێ ٣- خواردنی- شتی تر- بەرێگای- دەداتێ
feed/n ١- ژەم ٢- ئالیك
feedback/ˈfiːdbæk/n دەنگدانەوەی، سەدا، زایەڵ..
feel/fiːl/v ١- هەست دەکا ٢- واپێدەچێ ٣- هەست بەشتێ دەکا بە دەست لێدان ٤- دەرك پێدەکا

fancy/adj نائاسایی
fancy dress جلی نەناسینەوە
fancy/v ١- حەزی لێدەکا، ئارەزووی لێیە
٢-بۆخۆی کێش دەکا، سەرنجی بۆلای خۆی
رادەکێشێ/(جواني- لەش و لاری) بەلای خۆی
دەکێشێ ٣- خەیاڵ دەکا- وادادەنێ!
٤- بیردەکاتەوە، دڵنەی لێدەدا، بە خەیاڵ
وادەزانێ
fane/feɪn/n پەرستگا/پەیکەر
fanfare/ˈfænfeə(r)/n پارچە مۆسیقای
ناساندن یان کردنەوەی دەزگایەك..ئاواز
fang/fæŋ/n کەلبەی سەگ، ددانی
ژەهریني مار
fantasize/ˈfæntəsaɪz/v خەون دەبینێ
خەیاڵ دەکا، واهزر دەکا، وادەبینێ
fantastic/fænˈtæstɪk/adj ١- مەزن-
نایاب ٢- خەیاڵ ئامێز- زۆر مەزنە- زۆر باشە
٣- خەیاڵی- زۆر گەورە
fantastically/fænˈtæstɪkli/adv
بەشێوەیەکی زۆر باش/ زۆرخەیاڵی
fantasy/ˈfæntəsi/n خەیاڵ
far/fɑː(r)/adj ١- دوور ٢- ئەوپەڕ
far/adv ١- لە دوور
٢- ماوەیەکی درێژ٣- زۆر
as far as ١- هەمان دووری
٢- ئارادەی- بەگوێرەی...
by far بەبەراورد- بەزۆری
far from doing لەجیاتی
far from it دور لە/بە تەواوی پێچەوانە
go too far لەسنووری خۆی دەردەچی
لە دەسەلاتی خۆی زیاتر بە کاردێت
so far هەتا ئێستا
far away/adj ١-دوور ٢-نیگایەکی لابەلا
٢-خەواڵو
far-fetched/adj لە عەقڵ دوورە
زەحمەت باوەر بکرێ
far-reaching/adj کاریگەرێکی مەزن
far-sighted/adj دووربین
farce/fɑːs/n ١- شانۆگەری گاڵتە جاری
٢- گاڵتە جاری ٣- پێکەنیناوی
fare/feə(r)/n ١- کرێی گەشت
- هەقی- کرێی سواربوونی پاس
fare/n ئەو خواردنەی لەئوتێل و چێشتخانە
پێشکەش دەکرێت
fare/v ١-گەشت دەکا ٢-دەخوا
farewell/ˌfeəˈwel/interj خواحافیزی-
لەیەك جیابوونەوە
farm/fɑːm/n کێڵگە
farmhouse/ˈfɑːmhaus/n خانوی جوتیار
farmyard/ˈfɑːmjɑːd/n حەوشی کێڵگە
farm/v دەچێنێ
farming/ˈfɑːmɪŋ/n فەلاحەتی/جوتیاری
farther/ˈfɑːðə(r)/adj دوورتر
farthest/ˈfɑːðɪst/adj دوورترین
fascinate/ˈfæsɪneɪt/v شەیدای دەبێ
fascism/ˈfæʃɪzəm/n فاشیەت
fashion/ˈfæʃn/n ١- مۆدە٢- شێواز
fashionable/ˈfæʃnəbl/adj مۆدەی نوێ
دوا مۆدە
fast/fɑːst/adv-adj ١-خێرا ٢-لە پێش/
کاتژمێر
fast/adj ١- نەگۆڕ- چەسپاو ٢-ڕەنگ دانەکوتاو
fast/v - n بەرۆژوو دەبێ/بەڕۆژووبوون
fasten/ˈfɑːsn/v ١- دەگری/توند دەکا
٢- دادەنێ
fastidious/fæˈstɪdiəs/adj زیاد لە
پێویست ورد، بەوردکارییە
fat/fæt/adj - v ١- قەڵەو
٢- ئەستور، پڕ- قەڵەو دەبێ
fat/n ١- ماددەی چەوری ژێر پێست/
بەز/دونگ٢- چەور
fatal/ˈfeɪtl/adj ١-کوژەر- کوشندە
٢-شووم ٣-قەدەری ٤-یەکلاکەر

fallible/ˈfæləbl/adj دەکرێ هەڵە بکا، هەڵەی لێدەوەشێتەوە

false/fɔ:ls/adj ١- درۆ- نادروست
٢- دەستکرد ٣- دامەزراو لەسەر زانیاری هەڵە
٤- ساختە ٥- ناپاك ٦- گومراکەر

falsify/ˈfɔ:lsɪfaɪ/v درۆ هەڵدەبەستێ، ساختە دەکا، دەگۆڕێ

falter/ˈfɔ:ltə(r)/v ١- شپرزە دەبێ- هەنگاوەکانی پەرش و بڵاو دەبن
٢- نیگەران دەبێ- سەری لێدەشێوێ

fame/feɪm/n ناوبانگی

famed-famous/adj بەناو بانگ- ناسراو

familiar/fəˈmɪliə(r)/adj ١-ئاگادار- ئاشنا٢- ناسراو٣- خۆشەویست

familiarize/fəˈmɪliəraɪz/v دەناسێنێ، خۆی رادێنی

family/ˈfæməli/n ١- خێزان٢- منداڵ
٣- بنەماڵە- ماڵبات، خانەوادە
٤- بنەچە- رەسەن

run in the family بۆماوە لە

family name ناوی بنەماڵە/ نازناو

family planning دیاریکردنی رادەی منداڵ

family tree/n داری بنەماڵە-

famine/ˈfæmɪn/n برسێتی، قات و قڕی

famished/ˈfæmɪʃt/adj زۆر برسی، لە برسا مردوو

fan/fæn/n پانکە- باوەشێن

fan out/v ١- باوەشێن دەکا
٢- ئاگر خۆش دەکا بە ٣- بڵاودەبێتەوە

fan/n شەیدا، لایەنگر

fanatic/fəˈnætɪk/n دەمارگر

fanaticism/fəˈnætsɪzəm/n دەمارگریی

fancy/ˈfænsi/v ١- دڵیخۆش دەکا، خۆشنودی دەکا ٢- حەزی لێ دەکا

٢- بێ ئومێدی ٣- دواکەوتن
٤- لەکارکەوتن/دڵ راوەستان

faint/feɪnt/adj-v ١- کز
٢- لە هۆش خۆ چو ٣-لاواز ٤- دەبورێتەوە

fair/feə(r)/adj - n ١- دادوەر- راست
٢- راست و دروست ٣- باش- مامناوەندی
٤- قژ زەرد، پێست سپی٥- کەشی بێ باران

fair haired قژ زەرد، قژکاڵ

fair/adj دادوەرانە

fair/n ١- شوێنی رابواردن ٢- پێشانگا

fairy/ˈfeəri/adj جنۆکەیی، پەری، ئەفسانەیی

faith/feɪθ/n ١- باوەڕ
٢- باوەڕی- عەقیدە٣- ئایین

in good faith نیەت پاکی

faithful/ˈfeɪθfl/adj ١- دڵسۆز
٢- دەقاودەق، کت و مت

faithfulness/n دڵسۆزی- وەفایی

fake/feɪk/n-v ١-نادروست- گزی/ ساختە ٢- جادو
٣- گزی دەکا، دەگۆڕێ- تەزویر دەکا
٤- خۆ وایپیشان دەدا، خۆی وا دەنوێنێ

falcon/ˈfɔ:lkən/n باز، هەڵۆ

fall/fɔ:l/v ١- دەکەوێتە خوارەوە/دەکەوێ
٢- بەر دەبێتەوە٣- دەکەوێتە- رێکەوتی ... دەکا ٤- شۆڕ دەبێتەوە٥- هەرەس دێنێ
٦- دەکوژرێ ٧- دەدۆڕێ- دەبەزێ
٨- توشی داوی ئەڤینی دەبێ
٩- دابەش دەبێ/پۆلێن دەکرێ...

fall a part/v پارچە پارچە دەبێ/دەشکێ

fall/n ١- کەوتن ٢- کەوتنی باران ، بەفر..
٣- هاتنە خوارەوە- دابەزین- کەم بوونەوە
٤-هەرەس ٥- ئاڵگە ٦- خەزان/وەرین ٧- پایز

fallacy/ˈfæləsi/n بیرۆکەیەکی هەڵە- بەهەڵە چوون

# Ff

F-f/ef/ پیتی شەشەم لە ئەلفبای ئینگلیزی
fable/ˈfeɪbl/n چیرۆکی گیانەوەران
٢-ئەفسانە-پووچ-درۆ
fabric/ˈfæbrɪk/n ١- قوماش- چنین
٢- دیوارو بانو ... باڵەخانە
fabulous/ˈfæbjələs/adj ١- زۆر باش- نایاب
٢- ئەفسانەیی- نەرادەبەدەر(لە جوانیدا)
façade/fəˈsɑːd/n ١- دیواری پێشەوەی باڵەخانە ٢- روخساری دەرەوە
face/feɪs/n ١- دەم وچاو- روخسار
٢- لایەکی، روەکی...
faceless/ˈfeɪsləs/adj بێ چاوو روو/ بێ‌قیمەت
face cloth/n روخسار پاککەرەوە
face-lift/n کرداری جوانکردنی روخسار
face-saving/adj روسپێتی- پاراستنی ئابروو
face value/n ١-بەها، کورژم
٢-بەهای دەرەکی
face/v ١- رووی دەکەوێتە
٢- رووبەڕوو دەبێ... ٣- روو بەروو دەبێتەوە
٤- یەکێ ناچار دەکا مامەڵە دەگەڵ رەوشەکە بکات
Let's face it با دان پێدابنێین
facet/ˈfæsɪt/n ١- بەشێک لە شتێک
٢- لایەنێکی بەردی گران بەها (پیرۆز)
٣-دەرکەوتە
facetious/fəˈsiːʃəs/adj نابەجێ، لەجێ‌خۆ نەبوو
facial/ˈfeɪʃl/adj ١-روخساری
٢-تایبەت
facile/ˈfæsaɪl/adj ١-سەرپێیی، هاکەزایی
٢-باوەڕپەخۆبوو
facilitate/fəˈsɪlɪteɪt/v ئاسانکاری دەکا، سانا دەکا
facility/fəˈsɪləti/n ١- ئاسانکاری
٢- ئەدگاری سەربار- هۆکار
facsimile/fækˈsɪməli/n کت و مت/ وەک یەک
fact/fækt/n ١- راستی ٢- راستی یەکان
facts and figures زانیاری تێرو تەسەل
The facts of life راستیەیەکانی ژیان وەک رەفتاری سێکسی و منداڵ بوون....
faction/ˈfækʃn/n ١- کۆمەڵێکی بچوکی رکابەر
٢- کاری هونەری تێکەڵ لە خەیاڵ و واقیعی.
٣- ململانێی حیزبی
factor/ˈfæktə(r)/n ١- هۆکار
٢- ژمارەی تەواو بێچگە لەژمارە(١)
factory/ˈfæktri/n کارگە
factual/fækˈtʃuəl/adj هەقیقی، لە سەر راستی دامەزراو
faculty/ˈfæklti/n ١- توانست، توانای سروشتیو بیستن ٢- بەش، کۆلێژ
fad/fæd/n مەیل یان مۆدێلێکی کەم خایەن
fade/feɪd/v ١- رەنگی نامێنێ/رەنگی کاڵ دەبێ ٢- دەپوکێتەوە
٣- هێدی هێدی بزر دەبێ
faeces/ˈfiːsiːz/n پیسایی- گو
fag/fæg/n ١-جغارە- جگارە
٢-کارێکی بارگران
٣-زەحمەتکێش
Fahrenheit/ˈfærənhaɪt/n فەهرەنهایتی
fail/feɪl/v ١-سەرناکەوێ لە
٢-لە تاقیکردنەوە دەرناچێ ٣-ناتوانێ- دوا دەکەوێ لە ٤-نائومێد دەبێ، وازدێنێ
٥-تەندروستی تێک دەچێ٦-لەکار دەکەوێ
without fail هەردەم
failing/ˈfeɪlɪŋ/n خاڵی لاوازی، خەوش
failing/prep لەکاتی روودانی ...
failure/ˈfeɪljə(r)/n ١- سەرنەکەوتن

٢- سنور ٣- ئاست
exterior/ɪkˈstɪəriə(r)/adj دەرەوە-
ڕوخساری دەرەوە
exterminate/ɪkˈstɜːmɪneɪt/v
ڕەشەكوژی دەكا، لەنێو دەبا، قڕدەكا
extermination/ɪkˌstɜːmɪˈneɪʃn/n
قڕكردن
external/ɪkˈstɜːnl/adj ١- دەرەكی
٢- دەرەكی(دەرەوەیوڵات)
extinct/ɪkˈstɪŋkt/adj ١- دوابڕاو،
لەناوچوو ٢- خامۆش- دامركاو
extinction/ɪkˈstɪŋkʃn/n دابڕان
extinguish/ɪkˈstɪŋgwɪʃ/v دەكوژێنێتەوە
fire extinguisher/n ئاگر كوژێنەوە
extort/ɪkˈstɔːt/v چاوسوور دەكاتەوە-
هەڕەشەو گوڕەشە دەكا
extortion/ɪkˈstɔːʃn/n هەڕەشە كردن-
شت لێسەندن
بەهەڕەشەو گوڕەشە
extortionate/ɪkˈstɔːʃənət/adj
زۆر بەرز- لەرادەبەدەر، گرانبەها
extra/ˈekstrə/adj - adv - v ١- زێدە-
زیاد لەپێویست
٢- سەربار ٣- كۆمبارس
extract/ɪkˈstrækt/n دەرهێنان/هەڵكێشان
extract/v-n ١- دەردەهێنێ- هەڵدەكێشێ
٢- هەڵبژاردە- چەپكێ
extraction/ɪkˈstrækʃn/n ١- دەرهێنان
٢- ددان كێشان ٣- رەگەز- بەچە
extracurricular
/ˌekstrəkəˈrɪkjələ(r)/adj
دەرەوەی مەنهەج
extradite/ˈekstrədaɪt/v
تاوانبار تەسلیم بە ... دەكاتەوە

extradition/ˌekstrəˈdɪʃn/n
تەسلیم كردنەوەی تاوانباری هەڵاتوو
extraordinary/ɪkˈstrɔːdnri/adj
١- نائاسایی ٢- زۆر سەیر
extravagant/ɪkˈstrævəgənt/adj
١- دەست بڵاو
٢- ناواقیعی- لەدەست دەرچوو
extreme/ɪkˈstriːm/adj
١- ئەوپەڕ- دوور ٢- زۆر زۆر
٣- توندڕەو٤- پەرگر
extremity/ɪkˈstreməti/n
ئەوپەڕی- كۆتایی-
دوورترین خاڵ لە..
extremist/ɪkˈstriːmɪst/n توندڕەو-پەرگر
extremism/ɪkˈstremɪzəm/n
توندڕەوی- پەرگری
extricate/ˈekstrɪkeɪt/v
خۆی دەرباز دەكا لە ...
extrovert/ˈekstrəvɜːt/n كراوە، سادە
exuberant/ɪgˈzjuːbərənt/adj
چالاك، گوڕج و گۆڵ
eye/aɪ/n - v ١- چاو ٢- هێزی بینین
٣- كونی دەرزی ٤- پڕ نیشان
٥- چاودێری دەكا ٦- تەشتی دەگەڕێ
eye ball/ˈaɪbɔːl/n گلێنەی چاو
eye brow/ˈaɪbraʊ/n برۆی سەرچاو/برۆ
eye lash/ˈaɪlæʃ/n برژانگ
eye lid/ˈaɪlɪd/n پێڵو/پێستەی چاو
eyesight/ˈaɪsaɪt/n سۆمای بینین/
توانای بینین
eyesore/ˈaɪsɔː(r)/n ناحەز/قێزهێنَ
eye witness/ˈaɪwɪtnəs/n
بینەر- بەچاو دیتو/ گەواهیدەر
eye/v تەماشا دەكا/دیقەت دەكا/دەبینێ

expertise/ˌekspɜːˈtiːz/n
مەعریفەیەکی تایبەت–
شارەزایی، کارامەیی

expire/ɪkˈspaɪə(r)/v
کاریگەری نامێنێ– بەسەر دەچێ

expiry/ɪkˈspaɪəri/n نەمانی ماوە یان
نەمانی کاریگەری (دەرمان)، بەسەرچوون

explain/ɪkˈspleɪn/v ١– ڕوون دەکاتەوە/
شی دەکاتەوە– ڕاڤە دەکا

explanation/ˌekspləˈneɪʃn/n
١– شی کردنەوە/ ڕوون کردنەوە
٢–ڕاڤەکردن

explanatory/ɪkˈsplænətri/adj
تەفسیری– ڕونکەرەوە

explicable/ɪkˈsplɪkəbl/adj
ڕوونکردنەوە هەڵدەگری

explicit/ɪkˈsplɪsɪt/adj
١– ڕوون– ئاشکرا
٢– ئاشکرا– ڕاشکاو– ئەشاراوە

explicitly/adv به ڕوون و ئاشکرایی

explode/ɪkˈspləʊd/v دەتەقێتەوە/
دەتەقێنێ

exploit/ɪkˈsplɔɪt/v ١– بەکاردێنێ–
قۆرخ دەکا–بۆخۆی بەکاردێنێ
٢– دەداتە کار بۆ سود وەریگری

exploit/ˈeksplɔɪt/n ١–کردەیەکی
پەهلەوانی ٢–قۆرخەکردن

explore/ɪkˈsplɔː(r)/v دەگەڕێت،
دەدۆزێتەوە

exploration/ˌekspləreɪʃn/n دۆزینەوە

explorer/ɪkˈsplɔːrə(r)/n دۆزەوەر، ڕابەر

explosion/ɪkˈspləʊʒn/n تەقینەوە

explosive/ɪkˈspləʊsɪv/adj
١– دەتەقێتەوە– دەکری بتەقێتەوە
٢– کاریگەری ترسناکی هەیە
٣– تەقینەوە – تەقەمەنی

export/ɪkˈspɔːt/v دەنێری/دەنێرێتە دەرەوە

exporter/ɪkˈspɔːtə(r)/n نێنەر

export/ˈekspɔːt/n ١– ناردنە دەرەوە
٢– شمەکی بۆ دەرەوە نێردراو

expose/ɪkˈspəʊz/v
١– وادەکا دەرکەوێ– بەرچاو دەکا
٢– خۆی دەخاتە ڕەوشتێکی دژوار– ناڵەبار
٣– ئاشکرا دەکا– ڕاستی ئەپرو هەڵدەماڵێ
٤–ڕوناکی دەگەیەنێ

exposed/adj ئەشاراوە– مەکشوف
مەترسی لێدەکری

exposure/ɪkˈspəʊʒə(r)/n ١– کەوتنە بەر
٢– توش بوو(بەهەڵامەت)
٣– کرداری ئاشکراکردن– ڕووهەڵماڵین
٤– پڕوپاگاندەی ڕاگەیاندن ٥– وێنە

express/ɪkˈspres/v ١– دەردەبڕێ
٢– ڕای خۆی دەردەبڕێ

express/adj ١– خێرا ٢– ڕوون و ئاشکرا
٣– بە پۆستەی خێرا

expressly/adv ١– بەڕوون و ئاشکرایی
٢– بۆ مەبەستی تایبەت

express/n شەمەندەفەری خێرا

expression/ˈɪkˈspreʃn/n ١– دەربڕین
٢– دەربڕینی ڕوخسار/دەم و چاو
٣– هەست دەربڕین

expulsion/ɪkˈspʌlʃn/n دەرکردن/قاوردان

exquisite/ɪkˈskwɪzɪt/adj
نایاب/ تیژ

extend/ɪkˈstend/v ١– درێژ دەکا،
فراوان دەکا ٢– دەست پێ دەکا لە ... بۆ
٣– درێژ دەکا– ڕادەکشێ ٤– پێشکەشی دەکا

extension/ɪkˈstenʃn/n ١– پاشکۆی
باڵەخانە ٢– درێژکردنەوە ٣– تەلەفۆنی لاوەکی

extensive/ɪkˈstensɪv/adj فراوان،
بەرفرە

extensively/adv بە شێوەیەکی فراوان

extent/ɪkˈstent/n ١–بوار– ماوە

exhaust/ɪɡˈzɔːst/n - v ١- گرزۆز
٢- تەواو دەکا- شتێ هەمووی بەکار دێنێ
٣- هەموی دەڵێ

exhausted/adj ماندوو- شەکەت

exhausting/adj ماندووکەر- هیلاکەر

exhaustive/ɪɡˈzɔːstɪv/adj سەرلەبەر، هەموو/گشتگیر

exhibit/ɪɡˈzɪbɪt/n پیشاندراو لە... پیشانگا

exhibit/v ١- پیشاندەدا ٢- دەردەبڕێ

exhibitor/ɪɡˈzɪbɪtə(r)/n پیشاندەر

exhibition/ˈeksɪˈbɪʃn/n ١- پیشانگا
٢- پیشاندانی گشتی
٣- کرداری پیشاندان/دەربڕین

exhilarate/ɪɡˈzɪləreɪt/v کەیف خۆش/شادی دەکا
بەختەوەری دەکا

exile/ˈeksaɪl/n ١- نەفی کراو ٢- دەمنفا
٣- دوور دەخاتەوە/نەفی دەکا بۆ ...، تاراوگە

exist/ɪɡˈzɪst/v ١- هەبوو لە واقیعدا- هەیە ٢- دەژی

existence/ɪɡˈzɪstəns/n ١- بوون
٢- گوزەران

exit/ˈeksɪt, eɡzɪt/n – v ١- دەرچە- دەری ٢- دەرچوون
٣- دەردەچێ

exonerate/ɪɡˈzɒnəreɪt/v کەسێ لە لۆمە- گلەیی- رزگار دەکا

exorbitant/ɪɡˈzɔːbɪtənt/adj زۆر گران

exotic/ɪɡˈzɒtɪk/adj سەیر، نائاسایی

expand/ɪkˈspænd/v فراوان دەکا
گەورەتر دەکا

expanse/ɪkˈspæns/n شوێنێکی
کراوەی فراوان

expansion/ɪkˈspænʃn/n فراوانکردن-
فراوانکاری

expansive/ɪkˈpænsɪv/adj کراوە،
فراوانکراو
خۆشدوێ، خۆشنود

expatriate/ˌeksˈpætriət/n - v تاراوگە،
وڵاتی خۆی بەجێ دێڵێ

expect/ɪkˈspekt/v ١- چاوەڕێ دەکا
٢- پێشبینی دەکا٢- وا زەن دەبا

expectant/ɪkˈspektənt/adj چاوەڕێکراو

expectation/ˌekspekˈteɪʃn/n
چاوەڕێکردن- بە هیوابوون

expedient/ɪkˈspiːdiənt/adj بەسوودە،
یارمەتیدەرە بۆ مەبەستێ

expedition/ˌekspəˈdɪʃn/n ١- گەشتی
دۆزینەوە
٢- گەشتێکی درێژ بۆ مەبەستێکی تایبەت
٣- دەرچوون/گەشتێکی کورت

expel/ɪkˈspel/v ١- زۆری لێدەکا
(وڵات) بەجێ بێڵێ
٢- هەوا لە سییەکانی دەردەکا

expend/ɪkˈspend/v خەرج دەکا

expendable/adj دەتوانرێ/
دەکرێ وازی لێبهێنرێ

expenditure/ɪkˈspendɪtʃə(r)/n
خەرجی

expense/ɪkˈspens/n تێچوو
(لە کات وپارە) ٢- خەرجی

at sb's expense لەسەر خەرجی/
لەسەر حسابی

expensive/ɪkˈspensɪv/adj گرانبەها

experience/ɪkˈspɪəriəns/n-v
١- زانیاری- ئەزموون
٢- ڕووداوی گرنگ
٣- تاقی دەکاتەوە، هەست دەکا، دەچێژێ

experiment/ɪkˈsperɪmənt/n ئەزموون

experimental/ɪkˌsperɪˈmentl/adj
ئەزموونیی

expert/ˈekspɜːt/n پسپۆڕ/تایبەتمەند

excessive/ɪkˈsesɪv/adj پەرگی
لە سنور بەدەر، لە رادە بەدەر
exchange/ɪksˈtʃeɪndʒ/n - v
١- ئالو گۆڕ ٢- مشت و مڕ
٣- گۆڕینەوەی دراو٤- دراوی بیانی
٥- سەوداني دوو سەرە (هەردوولا بۆلای یەکتر)
٦- تەلەفۆن گۆڕ ٧- دەگۆڕێ
excise/ˈeksaɪz/n باج
excitable/ɪkˈsaɪtəbl/adj
زور هەلَدەچی، تورە دەبێ
excite/ɪkˈsaɪt/v ١- دەوروژێنێ
٢- کاردانەوەی لەلا دروست دەکا
excited/ɪkˈsaɪtɪd/adj
وروژاو - خرۆشاو
excitement/ɪkˈsaɪtmənt/n
١- هەماس- جۆش
٢- جۆشدەر٣- جۆش و خرۆش
exclaim/ɪkˈskleɪm/v
لەناکاو شتێ دەلَی- هوتاف دەدا
exclamation/ˌeksklәˈmeɪʃn/n
١- دەنگێ، وشەیێ کە
گوزارشت لە ئێشێکی ناکاو دەکا
٢- سەرسوڕمان
exclamation mark نیشانەی سەرسوڕمان
exclude/ɪkˈsklu:d/v ١- نایەلَی
بێتە ژوورێ
٢- بریاردەدا کە شتێ راست نیە- بەدوور
دەگرێ ٣- دەیبوێرێ/جیای دەکاتەوە
excluding/prep بێجگە
exclusion/ɪkˈsklu:ʒn/n نەهێشتن، بواردن
قەدەغەکردن - هەلاویردن
exclusive/ɪkˈsklu:sɪv/adj
١- بۆدەستەیەکی تایبەت- هەلَبژاردە
٢- بۆ تەنیا کەسێ یان کۆمەلَی- رۆژنامەیی
٣- بێجگە٤- تەنیا- تایبەت
exclusively/adv بەتەنیا- بەتایبەت
excrement: faeces/n پیسایی- گو

excrete/ɪkˈskri:t/v گو دەکا
excruciating/ɪkˈskru:ʃieɪtɪŋ/adj
ژ انێکی بەسوێ
excursion/ɪkˈskɜ:ʃn/n گەشتێکی کورت-
دەرچوون
excuse/ɪkˈskju:s/n لێبوردن
excuse/ɪkˈskju:z/v ١- داوای لێبوردن
دەکا
٢- لێی خۆش دەبێ ٣- دەبوورێ
٤- پۆزش دەهێنێتەوە
execute/ˈeksɪkju:t/v ١- لەداری دەدا-
دەیکوژێ ٢- ئەرکی رادەپەڕێنێ
execution/ˌeksɪˈkju:ʃn/n ١- لە داردان،
لە سێدارە دان- ئعدام ٢- راپەراندن
executioner/ˌeksɪkju:ʃәnә(r)/n
جەلاد- سەربڕ
executive/ɪgˈzekjәtɪv/adj
١- راپەراندن/جێبەجێکاری
٢- تایبەت بە گەورە پیاوان ٣- پایە بەرز
٤- دەستەی کارگێڕی
exemplary/ɪgˈzemplәri/adj
نموونە/نموونەیی
exemplify/ɪgˈzemplɪfaɪ/v دەنوێنێ-
نموونە دێنێ
exempt/ɪgˈzempt/adj - v هاوێردراو،
دەهاوێردرێ
بوردراو، دەیبوێرێ
exercise/ˈeksәsaɪz/n ١- مەشقی وەرزشی
٢- مەشقی لاشەیی٣- راهێنان
٤- زنجیرە کردارێك کە ئامانجێکی تایبەتی هەیە
٥- بەکارهێنان٦- مەشقی سەربازی
exercise/v ١- راهێنان/مەشق دەکا
٢- بەکار دەهێنێ
exert/ɪgˈzɜ:t/v ١- بەکاردەهێنێ
٢- کۆشش دەکا
exertion/ɪgˈzɜ:ʃn/n کۆشش

eviction/ɪˈvɪkʃn/n چۆلکردنی ڕەسمی
evidence/ˈevɪdəns/n بەڵگە
evident/ˈevɪdənt/adj ڕوون– ئاشکرا
evil/ˈi:vl/adj زۆرخراپ، نەگریس،
سەر بەرگێچەڵ
شەیتان/ئەهریمەن
evoke/ɪˈvəuk/v ١– وەبیری دێنەوە
٢– دەوروژێنێ
evolution/ˌi:vəˈlu:ʃn/n
١– گەشە، پەرەسەندن
٢– پرۆسەی گەشەکردن لە... بۆ
evolve/iˈvɒlv/v ١– گەشە دەستێنێ،
پەرە دەسێنێ لە.. بۆ
٢– وا لە شتێ دەکا گەشە بکا
ewe/ju:/n مەڕ
exact/ɪgˈzækt/adj ١– تەواو–وورد–
دروست ٢– لێهاتو
exactly/ɪgˈzæktli/adv ١–بەتەواوی
٢–بەوردی٣–بەڵێ، ڕاستە
exactness/ɪgˈzæktnəs/n وردی
exact/v بەخورتی دەبا
exaggerate/ɪgˈzædʒəreɪt/v
زێدەڕۆیی دەکا، پێوە دەنێ
زیاد لە پێویست دەڵێ
exaggeration/ɪgˌzædʒəˈreɪʃn/n
زێدەکاری– پێوەنان
exam/ɪgˈzæm/n تاقی کردنەوە/
ئەزموون
examination/ɪgˈzæmɪˈneɪʃn/n
١– لێکۆڵین– پشکنین– بەدواداچوون
٢– تاقی کردنەوە
examine/ɪgˈzæmɪn/v
١– دەپشکنێ/تاقی دەکاتەوە
٢– تاقی کردنەوەی پێ دەکا
examiner/ɪgˈzæmɪnə(r)/n
تاقیکردنەوە پێکەر/ ئەزموونکار

example/ɪgˈzɑ:mpl/n ١– نموونە
٢– پێشەنگ– نموونە
e.g–for example بۆنموونە
set a good example (to sb)
ببە نموونەی باش بۆ..
exasperate/ɪgˈzæspəreɪt/v
تووڕەی دەکا، هەراسانی دەکا
exasperating/adj تووڕەکەر
exasperation/ɪgˌzæspəˈreɪʃn/n
تووڕەیی، بێزاری زۆر/ تووڕە کردن
excavate/ˈekskəveɪt/v
١– هەڵدەقۆڵی/قوڕت لێدەدا
٢–هەڵدەکۆڵی/بە دوای پاشماوەی
کۆن دەگەڕێ
excavation/ˌekskəˈveɪʃn/n
هەڵکۆڵین/ گەران بە دوای شوێنەوار
exceed/ɪkˈsi:d/v ١– تێ دەپەڕێنێ–
زیاد دەکا لە
٢– لە بەری خۆی زیاتر پێ درێژی دەکا–
سنووری خۆی دەبەزێنێ
exceedingly/adv ١– زۆر ٢– لەسنوور بەدەر
excel/ɪkˈsel/v زۆر باشە لە
excellence/ˈeksələns/n نایابی
excellent/ˈeksələnt/adj نایاب،
هەرە باش
except/ɪkˈsept/prop بێجگە لە
except/ɪkˈsept/v ناگرێتەوە،
لە خۆناگری
exception/ɪkˈsepʃn/n هەڵاوێردن،
نەگرتنەوە، لە خۆ نەگرتن
without exception هەموو،
بێ جیاوازی هەموو
excerpt/ˈeksɜ:pt/n چەپکێك،
کورتەیەك، هەڵبژاردەیەك
excess/ɪkˈses/n زێدەڕەوی، بەرگری
in excess of زیاتر لە
excess/ˈekses/adj زێدە

euphoria/juːˈfɔːriə/n هەستێکی توندی هەست بە خۆشی کردن/بەختەوەری زێدە

Euro/ˈjʊərəʊ/n یورۆ- دراوی ئەورووپی

Eurocheque/ˈjʊərəʊtʃek/n چەکی ئەورووپی

European/ˌjʊərəˈpiːən/adj ئەورووپی- کەسی ئەورووپی

The European Community/n-E.C- کۆمەڵگەی ئەورووپی

The European Union یەکێتی ئەورووپی

euthanasia/ˌjuːθəˈneɪziə/n کوشتنی میهرەبانی

evacuate/ɪˈvækjueɪt/v چۆڵ دەکا

evacuation/ɪˌvækjuˈeɪʃn/n چۆڵکردنی شوێنێک لە خەڵک

evade/ɪˈveɪd/v ١- خۆی لێ لادەدا- خۆی بەرکەنار دەگرێ ٢- هەڵدێ لە- خۆی دوور دەگرێ- خۆی دەداتە پاش

evaluate/ɪˈvæljueɪt/v هەڵدەسەنگێنێ، دەنرخێنێ

evaluation/ɪˌvæljuˈeɪʃn/n هەڵسەنگاندن

evangelical/ˌiːvænˈdʒelɪkl/adj ئینجیلی

evaporate/ɪˈvæpəreɪt/v ١- دەبێتە هەڵم- بە هەوا دادەچێ ٢- لە بەر چاو نامێنێ

evasion/ɪˈveɪʒn/n هەڵاتن لە، خۆدزینەوە لە

evasive/ɪˈveɪsɪv/adj هەوڵدەدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ خۆی بدزێتەوە لە

eve/iːv/n ١- رۆژی یان ئێوارەی پێش جەژن ٢- دایکە حەوا

even/ˈiːvn/adj ١- تەخت ٢- نەگۆڕ ٣- وەك یەك ٤- جووت ژمارە (دابەش بوو بەسەر ژمارەدوو)

be/get even ئازاری دەدا، تۆڵەی لێدەکاتەوە

break even را لێ بکەی ئەزمەر بکا نەقازانج

evenly/adv وەك یەکی بەیەکسانی

even/ˈiːvn/adv ١- هەتا، تا

even if هەتا ئەگەر

even so سەرەرای ئەوەی

evening/ˈiːvnɪŋ/n ئێوارە

event/ɪˈvent/n ١- رووداو ٢-پێشبڕکێ

at all events هەرچۆنێبێ، هەرچی رو بدا

in any event لەکاتی رووداني

in the event of sth ئەگەر رویدا

eventful/ɪˈventfl/adj رووداوی گرنگ، پڕ کارەسات

eventual/ɪˈventʃuəl/adj روودەدا لە ئەنجامی، لە کۆتاییدا روودەدا

eventually/ɪˈventʃuəli/adv لە کۆتاییدا

ever/ˈevə(r)/adv ١- لە هەر کاتێکدا ٢- لەکاتی لەکاتەکاندا لە تەمەنتدا ٣- هەردەم

ever after هەتاهەتایی

ever since لەوساوە

ever so زۆر

evergreen/ˈevəgriːn/n هەردەم سەوز

everlasting/ˌevəˈlɑːstɪŋ/adj هەمیشەیی

every/ˈevri/det ١- هەموو- هەریەك ٢- ئەوەی دەکرێ ٣- هەر

everybody/ˈevribɒdi/pron هەر کەسێك

everyday/ˈevrideɪ/adj هەموو رۆژێ- رۆژانە

everything/ˈevriθɪŋ/pron ١- هەموو شتێ، هەرشتێ ٢- گرنگترین شت

evict/ɪˈvɪkt/v زۆری لێدەکا- خۆی زەوی خۆی- بەجێبێڵێ

escalate/ˈeskəleɪt/v ١- بەمێزتری دەکا
٢- مەزنتر-بەرزتر دەبێ
escalator/ˌeskəleɪtə(r)/n
پەیژەی بزوێنەر- قادرمەی کارەبایی
escapade/ˌeskəˈpeɪd, ˈeskəpeɪd/n
سەرکەشی
escape/ɪˈskeɪp/v - adj ١- رادەکا-
دەرباز لە.. ٢- تێ دەچێ- ئەڵێی (گازی ئەڵێی)
٣- رزگاری دەبێ- خۆی دوور دەگرێ
٤- لەبیری دەچێ- بەسەری تێ دەپەڕێ-
تێبینی ناکرێ ٥- راکردوو- هەڵاتوو
escape/n ١- هەڵاتن- رزگار بوون
٢- هۆکاری هەڵاتن- خۆ رزگار کردن
٣- هەڵاتن (لەخەم و کێشە)
escort/ˈeskɔːt/n - v ١- یاوەر-
پاسەوان ٢- هاوڕێ
٣- یاوەری دەکا ٤- دەگەیەنێ- دەبا بۆ
Eskimo/ˈeskɪməʊ/n ئیسکیمۆ
especial/ɪˈspeʃl/adj تایبەت- نائاسایی
especially/ɪˈspeʃəli/adv ١- بە تایبەتی
٢- بەمەبەستی ٣- زۆر
espionage/ˈespiənɑːʒ/n جاسوسی-
سیخوڕی
espouse/v لایەنگری دەکا- ژن دێنێ
essay/ˈeseɪ/n وتار، بابەتێکی ئەدەبی
essence/ˈesns/n ١- کرۆک- کاکڵ
٢- گیان
essential/ɪˈsenʃl/adj ١- پێویستی-
سەرەکی-بنەرەتی ٢- پێویستییەکان
essentially/adv لە راستیدا-
بە شێوەیەکی سەرەکی
establish/ɪˈstæblɪʃ/v ١- دادەمەزرێنێ
٢- دروست دەکا- فەراهەم دێنێ
٣- دەچەسپێنێ- رەگ دادەکوتێ
٤- دیار دەکا- بڕیار دەدا ٥- دەسەلمێنێ

establishment/ɪˈstæblɪʃmənt/n
١- دامەزراندن ٢- دەزگا
٣- دەسەڵاتدار- کاربەدەست
estate/ɪˈsteɪt/n ١- موڵک- خانوبەرە
٢- کۆمەڵگا ٣- پاشماوە - میرات
estate agent- realtor;
real estate agent/n
دەلالی خانوبەرە
esteem/ɪˈstiːm/n رێز
estimate/ˈestɪmət/n ١- خەمڵاندن-
قرساندن- هەڵسەنگاندن ٢- نرخ دان بۆ شتێ
estimate/ˈestɪmeɪt/v هەڵسەنگێنێ-
دەنرخێنێ
دەخەمڵێنێ- دەقرسێنێ
estranged/adj ١- جیابوونەوە لە
(ژن/مێرد) ٢- دوور لە- خۆ دوورخەر
estuary/ˈestʃuəri/n نارزێگە، پێژگە
eternal/ɪˈtɜːnl/adj ١- بێسەرەتاو
کۆتایی- نەمری- هەتاهەتایی-
ژیانی پاش مردن ٢- هەمیشە دووبارە
eternally/ɪˈtɜːnəli/adv هەردەم
eternity/ɪˈtɜːnəti/n ١- هەردەمی،
ژیانی پاش مردن ٢- ماوەیەکی درێژ
ethics/ˈeθɪks/n ١-ئاکارزانی
٢- باوەڕی دەربارەی ئەوەی لەڕووی ئاکارەوە
راستە یا چەوتە
ethical/ˈeθɪkl/adj ١- رەوشتی- ئاکاریی
٢- دروست لە رووی رەوشتەوە
ethnic/ˈeθnɪk/adj رەگەزی - نەتەوەیی
etiquette/ˈetɪket/n ئەتەکێت،
شێوازی رەفتار کردن
etymology/ˌetɪˈmɒlədʒi/n
١-ئیتمۆلۆژی، لێکۆڵینەوە لەرەسەنی وشە
٢- رونکردنەوەی رەسەن و مێژووی وشە
euphemism/ˈjuːfəmɪzəm/n
دوان - یوفیمیزم

demand/v ١- داوادەکا
٢- پێویست دەکا ٢- پرسیار دەکا
demanding/adj ١- تێکۆشانیکی
زۆری دەوێ ٢- خوازۆك
demeanour/dɪˈmiːnə(r)/n ڕەفتار
demented/dɪˈmentɪd/adj شێت/بێ‌عەقل
demise/dɪˈmaɪz/n ١-مردن٢- نەمان
demist/ˌdiːˈmɪst/v دەیسڕێتەوە-
خوناو لادەبا
demobilization/ˌdɪˌmɒbəlaɪˈzeɪʃn/n
بواردن (لە ڕاژەی سەربازی)
demobilize/dɪˈməʊbəlaɪz/v
لەڕاژەی سەربازی دەبوردری
democracy/dɪˈmɒkrəsi/n
دیموکراسیەت/حوکمی گەل
democrat/ˈdeməkræt/n دیموکرات،
لایەنگری حوکمی گەل
democratic/ˌdeməˈkrætɪk/adj
دیموکراتی
demolish/dɪˈmɒlɪʃ/v وێرانی دەکا
demolition/ˌdeməˈlɪʃn/n وێرانکردن/
خاپورکردن
demon/ˈdiːmən/n شەیتان/جنۆکە/ دێو
demonstrable/dɪˈmɒnstrəbl/adj
دەکرێ بەرێگای بەڵگەوە پیشانبدرێ-
زیاتر روون بکرێتەوە
demonstrate/ˈdemənstreɪt/v
١- دەردەخا، پیشان دەدا
٢- ئیسپات دەکا، دەسەلمێنێ
٣- پرۆتیستۆ دەکا، خۆپیشاندان دەکا
demonstration/ˌdemənˈstreɪʃn/n
١- پیشاندان/بەڵگە ٢- خۆپیشاندان
demonstrative/dɪˈmɒnstrətɪv/adj
١- ناوی ئاماژە، نیشانە
٢- دەربڕینی هەست و نەشاردنەوەی
demonstrator/ˈdemənstreɪtə(r)/n
١- نمایشکار
٢- خۆپیشاندەر/بەشدار لە خۆپیشاندان
demoralize/dɪˈmɒrəlaɪz/v
ڕەوشتی تێك دەدا
ورەی دەشکێنێ/دەڕوخێنێ
demote/ˌdiːˈməʊt/v پلەی دەمێنێتە
خوارێ/ پلەی دادەبەزێنێ
demur/dɪˈmɜː(r)/n - v
١-بەرهەڵستیدەکا ٢- ناڕەزایی
demure/dɪˈmjʊə(r)/adj شەرمن/بەحەیا
سەنگین
den/den/n ١- لانە- مێلانە
٢- ژووری دیراسە
denial/dɪˈnaɪəl/n ١- ڕەتکردنەوە
٢- بەدرۆخستنەوە
denim/ˈdenɪm/n چنین/قوماشی کاوبۆی
denomination/dɪˌnɒmɪˈneɪʃn/n
تایەفە/مەزهەب
denote/dɪˈnəʊt/v نیشانەی ئەوەیە/
دەلالەتی ئەوە دەدا
denounce/dɪˈnaʊns/v بەراشکاوی
ڕەخنە دەگرێ
dense/dens/adj ١- خەست/چڕ ٢- گێل
dental/ˈdentl/adj ددانی
dentist/ˈdentɪst/n ددانساز/دکتۆری ددان
dentistry/ˈdentɪstri/n ددانسازی
denture/ˈdentʃə(r)/n ددانی تاخم/
ناسروشتی
denude/dɪˈnjuːd/v ڕووتی دەکاتەوە
denunciation/dɪˌnʌnsiˈeɪʃn/n
ناڕەزایی دەربڕین، تاوانبار کردن
deny/dɪˈnaɪ/n ١- نکوڵی دەکا
٢- بەدرۆی دەخاتەوە ٣- نامێلێ، بێبەری دەکا
deodorant/diˈəʊdərənt/n
لابەری بۆنی ناخۆش (ژێر باڵ یان بن هەنگڵ)
depart/dɪˈpɑːt/v بەجێدێڵێ، دەڕوا،
کۆچ دەکا

degrade/dɪˈgreɪd/v ١- كەسێن كەم دەكا
٢- ریسوای دەكا- بێ ریزی دەكا
degree/dɪˈgriː/n ١- پلەی گەرما
٢- پلەی گۆشە ٣- بڕ ٤- پلەی زانستی
dehydrate/diːˈhaɪdreɪt/v
١- وشك دەكاتەوە ئاوی لێدەگرێ
٢- ئاو لەلەش دەگرێ
dehydrated/adj (تەڕەی) وشك
deice/v ڕادەماڵێ/ لادەبا
deify/v دەیپەرستێ/ دەیكاتە خوای خۆی
deign/deɪn/v دەست بەردار دەبێ/دەبەخشێ
deity/ˈdeɪəti/n خوداوەند/بت/پەرستراو
dejected/dɪˈdʒektɪd/adj دڵتەنگ/
ناشاد/نائومێد
delay/dɪˈleɪ/v ١- دوادەخا/فەرامۆش دەكا
٢- دوادەخا بۆ كاتێكی تر٣- گیرۆ دەكا
delegate/ˈdelɪgeɪt/v-n ١-نوێنەر/نێردراو
٢- دەنێرێ ٣- لەجێی خۆی رادەسپێرێ
delegation/ˌdelɪˈgeɪʃn/n
١- شاند- نوێنەر ٢- نوێنەرایەتیكردن
delete/dɪˈliːt/v ١- لادەبا/دەسڕێتەوە
٢- رەش دەكاتەوە
deletion/dɪˈliːʃn/n لابردن/رەشكردنەوە
deliberate/dɪˈlɪbərət/adj - v
١- ئەنقەست/مەبەست
٢- لەسەرخۆیی٣- راوێژدەكا
٤- بەقووڵی بیردەكاتەوە/لەگڵ فكران رادەچێ
deliberation/dɪˌlɪbəˈreɪʃn/n
١- راوێژكردن/ دان وستاندن
٢- لەسەرخۆیی
delicacy/ˈdelɪkəsi/n ١- نیانی؛
نەرم و نیانی ٢- پارووی خۆش/چەور
delicate/ˈdelɪkət/adj نەرم/خۆشمەشرەب
delicatessen/ˌdelɪkəˈtesn/n كۆگای
فرۆشتنی گۆشتی ناو بەفرگرە/ خواردنی
قوتوبەند

delicious/dɪˈlɪʃəs/adj ١- بەتام/خۆش
٢- نوكتە
delight/dɪˈlaɪt/n-v خۆش- شادی/
دڵشادی دەكا
delightful/dɪˈlaɪtfl/adj خۆش/
بەتام/دڵشادكەر
delinquency/dɪˈlɪŋkwənsi/n لاساری/
تاوانی لادان
delinquent/dɪˈlɪŋkwənt/adj لاسار؛
لادەر
delirious/dɪˈlɪriəs/adj وڕێنە- وڕێنەكەر
delirium/dɪˈlɪriəm/n وڕێنە/قسەی قۆڕ
deliver/dɪˈlɪvə(r)/v ١- رزگاردەكا
٢- یارمەتی دەدا تامنداڵی ببێ/رزگاری ببێ
٣- دەگەیەنێ ٤- وتاردەدا
٥- بەڵێنی جێبەجێ دەكا ٦- دەیپێكێ
deliverance/dɪˈlɪvərəns/n رزگاربوون
delivery/dɪˈlɪvəri/n ١- گەیاندنی
شت وەك ٢- زان/منداڵ بوون
٣- وتاردان/شێوازی وتاردان
delta/ˈdeltə/n ١- چوارەم پیتی
ئەلفبای یۆنانی ٢- رووباری دلتا
٣- شێوە سێگۆشەیی
delude/dɪˈluːd/v فێڵی لێدەكا؛
چەواشەی دەكا
deluge/ˈdeljuːdʒ/n-v ١- بارانێكی زۆر/
شاڵاو/لافاو
٢- كۆمەڵە شتێكی زۆر لە یەك كاتدا
٣- بە لافاو شتی پێدەگا
delusion/dɪˈluːʒn/n خەیاڵ
deluxe/dəˈlʌks/adj نایاب
delve/delv/v لەناو شت دەگەڕێ/هەڵدەقوڵێ
demand/dɪˈmɑːnd/n ١- داخوازی-
داواكاری ٢- داوا
in demand/adj ٣- بە هەرمێن- بە رەواج
on demand هەركاتێ داوا بكەی

defect/dɪˈfekt/n - v ١– خەوش، کێماسی، کەم و کوڕی ٢– دەچێتە پاڵ– هەڵدەگەڕێتەوە

defection/dɪˈfekʃn/n هەڵگەڕانەوە– چوونە پاڵ دوژمن

defective/dɪˈfektɪv/adj خەوشدار

defence/dɪˈfens/n بەرگری– پاراستن

defenceless/adj نەپارێزراو بێبەرگری،ناتوانێ بەرگری بکا

defend/dɪˈfend/v بەرگری دەکا،داکۆکی دەکا

defendant/dɪˈfendənt/n

١– تاوانبارکراو بە

٢– داوا لەسەر تۆمارکراو

defender/dɪˈfendə(r)/n داکۆکیکەر– بەرگریکار

defensive/dɪˈfensɪv/adj ١– بەرگریکار

٢– حاڵەتی یان هەڵوێستی بەرگری

٣– ئامادەیە بەرگری لەخۆ–ای‌ی– بکا

defer/dɪˈfɜː(r)/v ١– دوادەخا

٢– دەکەوێتە ژێر دەستی کەسی دی

deference/ˈdefərəns/n ڕێز– گوێ ڕایەڵی

defiance/dɪˈfaɪəns/n بەرەنگاری– یاخیبوون

defiant/dɪˈfaɪənt/adj یاخی– بەرەنگار

deficiency/dɪˈfɪʃnsi/n کەمی، کەمتەرخەمی

deficient/dɪˈfɪʃnt/adj کەم

mentally deficient کەم عەقڵ

deficit/n - v کەم دەکا، کەمکردن

defile/dɪˈfaɪl/n تێک دەدا، پیس دەکا پیرۆزی دەبەزێنێ– بێحورمەتی دەکا

defilement/dɪˈfaɪlmənt/n پیسکردن– پیرۆزی بەزاندن/ بێحورمەتی

define/dɪˈfaɪn/v ١– دیاردەکا

٢– پێناسە دەکا ٣– ڕوون دەکاتەوە

definite/ˈdefɪnət/adj ١– دیارکراو– زانراو– یەکلاکەر

the definite article/n ٢– ناسیاو/ ناسین ئامرازی ناسین

definitely/ˈfefɪnətli/adj بەدڵنیایی، بێگومانی

definition/ˌdefɪˈnɪʃn/n ١– پێناسە

٢– دیارکردن ٣– ڕوون و ئاشکرایی

definitive/dɪˈfɪnətɪv/adj

دوا بڕیاری یەکلاکەرەوە

deflate/diːˈfleɪt/v فس دەکاتەوە– بەتاڵ دەکاتەوە

deflation/ diːˈfleɪʃn/n چونەوەیەک– کەمکردنەوە، خاڵی کردنەوە

deflect/dɪˈflekt/v لادەدا– لەڕووت لادەدا

deflection/dɪˈflekʃn/n لادان

deform/dɪˈfɔːm/v دەشێوێنێ

deformed/adj شێواو، ناسروشتی، نائاسایی

deformity/dɪˈfɔːməti/n شێواندن، کەم و کورتی جەستەیی

defraud/dɪˈfrɔːd/v گزێری، فێڵ

defrost/ˌdiːˈfrɒst/v ١– لابردنی بەفر لە بەفرگر

٢– تواندنەوەی خواردنی بەستوو

deft/deft/adj کارامە، لەش سوک

defuse/ˌdiːˈfjuːz/v

١– هەڵوەشاندنەوەی بۆمب/ لەکارخستنی بۆمب

٢– هێورکردنەوەی ڕەوش/ گرژی کەم دەکاتەوە

defy/dɪˈfaɪ/v ١– بەرەنگاری دەبێ– یاخی دەبێ

٢–مەرج دەکەم ناتوانیەم کارە بکەی

٣–شتێ دژوار بکەی

degenerate/dɪˈdʒenəreɪt/v

نشوستی دێنێ، خراپتر دەبێ

degeneration/dɪˈdʒenəˈreɪʃn/n

تێکچون، ڕزچون، لادان

٤- کاغەزی یاری-قومار-

deck/dek/v ٥- دەڕازێنێتەوە

declaim/dɪˈkleɪm/n وتار دەدا بە زمانی هەماسەت

declaration/ˌdekləˈreɪʃn/n
١- ئاگاداری- بەیاننامە ٢- ڕاگەیاندن

declare/dɪˈkleə(r)/v ١- ڕادەگەیەنێ
٢- زانیاری دەدا لەبارەی..

declension/n ١-پۆلین کردنی -ناو- ڕێزمان
٢-لادان

decline/dɪˈklaɪn/v - n ١- ڕەت دەکاتەوە- بەئەدەبانە ٢- دەپوکێتەوە، بچوکتر دەبێتەوە، دێتەخوارێ، لاوازتر دەبێ ٣- هەرەس، داڕوخان
٤- باری تەندروستی تێك دەچێ

decode/ˌdi:ˈkəud/v هێما لێك دەداتەوە هێماکان دەکاتەوە

decoder/ˌdi:ˈkəud/n ئامێری هێماکەرەوە

decompose/ˌdi:kəmˈpəuz/v بۆگەن دەبێ، دەڕزێ، شی دەکاتەوە

décor/ˈdeɪkɔ:(r)/n دیکۆر، جوانکردن

décorate/ˈdekəreɪt/v ١- جوان دەکا- دەڕازێنێتەوە ٢- بۆیاغ دەکا
٣- مەدالیا دەبەخشێ بە..

١- جوانکردن
décoration/dsekəˈreɪʃn/n
٢- مەدالیا - دیکۆر کردن

décorative/ˈdekərətɪv/adj
ڕازاوە/نەخش و نیگاری..

décorator/n سەر باڵەخانە/دیکۆرساز

décorous/ˈdekərəs/adj
بەئەدەب، شیاو، خۆداپۆش

décorum/dɪˈkɔ:rəm/n خۆداپۆش، ڕەفتاری باش/دروست

decoy/ˈdi:kɔɪ/n تەلە

decrease/dɪˈkri:s/v - n کەمکردن، کەم دەکا

decree/dɪˈkri:/n - v فەرمان- بڕیار
فەرمان دەردەکا، بڕیار دەدا

decrepit/dɪˈkrepɪt/adj پیر، پەککەوتە

decrepitude/dɪˈkrepɪtju:d/n
ئاشێ لەبەر پیری- بەساڵاچوویی، داڕوخان

dedicate/ˈdedɪkeɪt/v ١- تەرخان دەکا
٢- پێشکەش دەکا- دەکاتە دیاری

dedication/ˌdedɪˈkeɪʃn/n تەرخانکردن، دیاری پێشکەشە بە

deduce/dɪˈdju:s/v بەدەست دێنێ- فەراهەم دێنێ

deduct/dɪˈdʌkt/v ١- لێی دەردێنێ
٢- لێی دادەشکێنێ

١- لێدەرهێنان
deduction/dɪˈdʌkʃn/n
٢- بەدەستهێنان

deed/di:d/n ١- کار- کردەوە
٢- بەڵگەنامەی یاسایی

deem/di:m/v وادادەنێ

deep/di:p/adj ١- قووڵ(دەریا)
٢- دەنگی نزم
٣- زێدەڕۆیی- تاری

deepen/ˈdi:pən/v قووڵ دەکا

deep-freeze/n بەستەر- بەستەڵەك

deep-rooted/adj ڕەگ داکوتاو

deer/dɪə(r)/n مامز- ئاسك

deface/dɪˈfeɪs/v دەشێوێنێ

defamation/ˌdefəˈmeɪʃn/n ئاوزڕاندن/ ئاوپیس کردن/ لەکەدارکردن

defamatory/dɪˈfæmətri/n
ئاوزڕان- جوێندانی

default/dɪˈfɔ:lt/n - v کەمتەرخەمی، ئامادەنەبوون
کەمتەرخەمی دەکا لە..

defaulter/n کەمتەرخەم- یاخیبوو

defeat/dɪˈfi:t/v دەشکێنێ- بەسەردەکەوێ دوژمن-دەشکێنێ- دەبەزێنێ

defeatism/dɪˈfi:tɪzəm/n پەتای بەزین/ گیانی شکان و بەزین

debatable/dɪˈbeɪtəbl/adj مشت ومڕ
هەڵدەگری/ گومان هەڵدەگری
debate/dɪˈbeɪt/v مشت ومڕ- ڕووبەڕوو
١- مشت ومڕ دەکا
٢- دەگۆڕی- بیردەکاتەوە.. تاییکۆڕی
debauch/dɪˈbɔːtʃ/v تێك دەدا،
داوێن پیسی دەکا
debauchery/dɪˈbɔːtʃəri/n خراپەکاری،
داوێن پیسی، شوێنی داوێن پیسی
debenture/dɪˈbentʃə(r)/n بۆندی قەرد
debility/dɪˈbɪləti/n لاوازی/تەندروستی
خراپ بوون
debit/ˈdebɪt/n - v قەرد، دەسمایەی قەرد/
لەسەری‌حساب کرد
debonair/ˌdebəˈneə(r)/adj/ نێسك سوك
خوێن شیرین
debrief/ˌdiːˈbriːf/v زانیاری لێوەرگرتن
debris/ˈdebri/n پارچەپارچەی، چل وچێو
debt/det/n قەرد
debtor/ˈdetə(r)/n قەردار
دەسالان/ دەیە
decade/ˈdekeɪd/n
decadence/ˈdekədəns/n ١- پوکانەوە،
رۆچوون ٢-لاسایی رەوشتی
decadent/ˈdekədənt/adj رەوشت نزم/
بێ‌ڕەوشت، داڕوخاو
decamp/dɪˈkæmp/v هەڵدێ-تێ‌دەتەقێنی
decapitate/dɪˈkæpɪteɪt/v سەری دەبڕی،
لەملی دەدا
decarbonize/v کاربۆن لە.. لادەبا
decay/dɪˈkeɪ/v تێك دەچی،
بۆگەن دەبێ، دەپوکێتەوە
deceased/dɪˈsiːzd/adj کۆچکردوو،
خوالێخۆشبوو
deceit/dɪˈsiːt/n گزی، فێڵ
deceitful/dɪˈsiːtfl/adj فێڵبان، دەروپوو
deceive/dɪˈsiːv/v فێڵ دەکا، قۆپیە دەکا

December/dɪˈsembə(r)/n
مانگی کانونی یەکەم
decency/ˈdiːsnsi/n ڕەوشت باشی/
رەفتاری باش
decent/ˈdiːsnt/n ١- بەڕێز
٢- ناوە ناوە باش، ماممناوەندی
٣- خۆداپۆش٤- شیاو، گونجاو
decentralize/diːˈsentrəlaɪz/v
١- لەدەسەڵاتی ناوەندی دادەبڕی
٢- دەسەڵات دان بەئەنجومەنە ناوخۆییەکان-
ناوچەییەکان
deception/dɪˈsepʃn/n گومراکردن-
گزی- فێڵ- سەر لێ شێواندن
deceptive/dɪˈseptɪv/adj گومراکەر،
درۆزن، کەنکەڵەیی- خەیاڵی
decibel/ˈdesɪbel/n یەکەی پێوانی
بەرزێتی دەنگ
decide/dɪˈsaɪd/v ١- بڕیاردەکا-
بیردەکاتەوە لە ٢- یەکلادەکاتەوە
٣- وادەکا بڕیاربدا، ناچاری دەکا بڕیار بدا
decided/adj - سورە لەسەر- موکوڕ
- ڕشدە لەسەر- یەکلاکەرەوە-
روون و ئاشکرا
decidedly/adv یەکلاکەرەوە
بەبێ گومانی- بەبێ دوو دڵی
deciduous/dɪˈsɪdʒuəs/adj
گەڵاکانی لە پاییزدا دەوەرن
وەریو/خەزانگرتوو
decimal/ˈdesɪml/n دەیی
decipher/dɪˈsaɪfə(r)/v
١- هێما لێکدەداتەوە ٢- تەسلیم دەکاتەوە
decision/dɪˈsɪʒn/n ١- بڕیار
٢- سووربوون- ڕشتی
decisive/dɪˈsaɪsɪv/adj دوابڕیار-
یەکلاکەرەوە
deck/dek/n ١-پشت یان پڕوی کەشتی
٢- نهۆم لە پاپۆڕ یان پاس
٣- ئامێری قەوان و کاسێت

dash/dæʃ/n – v ١– هەڵپە ٢– (ـ)کورتەهێڵ
٣– هەندێ لە ٤– تێك دەدا
٥– دەپرژێنێ ٦– بەپەلە
dashboard/ˈdæʃbɔːd/n تەختەی پێوانە
dashing/adj جەسور/ بەجەرگ
data/ˈdeɪtə/n داتە
date/deɪt/n ١– دارخورما
٢– خورما ٣– مێژوو، کات
out of date کاتی بەسەر چووە
up to date هاوچەرخ
کوڕی زەمەنی خۆیەتی، لەگەڵ کات دەڕوا
٤– ژوان
dated/ˈdeɪtɪd/adj کۆن، دێرین
daub/dɔːb/v پیس دەکا
daughter/ˈdɔːtə(r)/n کچ، کچی
daughter-in-law/n بووك، ژنی کوڕ
daunt/dɔːnt/v ورەی دادەمرکێ، دەترسێ
nothing daunted هیچ شتێ
ورەی نایەنەتە خوارێ
dauntless/ˈdɔːntls/adj نەترس، جەسوور
dawdle/ˈdɔːdl/v کات بە فیڕۆ دەدا/
بەلادا دەکەوێ
dawn/dɔːn/n-v شەبەق، بەری بەیان،
سەحەر، کازیوە
شەبەق دەدا، ڕۆژ هەڵدێ
day/deɪ/n ڕۆژ
daybreak/ˈdeɪbreɪk/n بەرەبەیان، کازیوە
daylight/ˈdeɪlaɪt/n کزنگ
daylight saving پێشخستنی کاتژمێرێك
لە هاوین بۆ سود وەرگرتن لە ڕۆژ
daytime/ˈdeɪtaɪm/n لە کاتی ڕۆژدا
daze/deɪz/v گێژ دەبێ، وڕدەبێ
daze/n گێژبوون، وڕبوون، لەخۆچوون
in a daze/n لەحاڵەتی تورەبووندا
dazzle/ˈdæzl/v تاوی چاوی دەبا،
کۆڕەمنی دەکا

dead/ded/adj ١– مردوو/ لەکارکەوتوو
٢– وەك یەك ٣– بێ هۆش– بێ هەست
٤– بەدروستی لەکاتی خۆی
deaden/ˈdedn/v ١– دادەمرکێنێ، کزدەکا
٢– کپ دەکا ٣– دەمرێنێ
deadline/ˈdedlaɪn/n دوامۆڵەت
deadly/ˈdedli/adj بکوژ، کوژەر
deaf/def/n - adj کەڕ
deaf-aid ئامێری بەهێزکردنەوەی گوێ
deafen/ˈdefn/v (گوێ) کەڕ دەکا
deal/diːl/n - v ١– بڕ
٢– دابەشکردنی کارتی قومار
٣– مامەڵەی بازرگانی ٤– مامەڵە– ئاڵوێل
٥– داری سپی ٦– کارت دابەش دەکا
٧– مامەڵە... دەکا
dealer/ˈdiːlə(r)/n بازرگان
dealings/ˈdiːlɪŋz/n مامەڵە لەگەڵ کردن–
کڕین و فرۆشتن
dean/diːn/n ڕاگر، پلەیەکی بەرزی کەنیسە
deanery/ˈdiːnəri/n ڕاگرایەتی
deanship/n ڕاگرایەتی
dear/dɪə(r)/adj ١– ئازیزخۆشەویست
٢– گران– گرانبەها
Oh dear یاهاوار!– پەکوو!
dearth/sɜːθ/n برسیەتی– کەمیی–
دەگمەنی خواردن
death/deθ/n ١– مردن– مەرگ٢– کۆتایی
death penalty/n سزای مەرگ
death rate/n ڕێژەی مردن
death toll/n ژمارەی کوژراوان
death warrant بەڵگەنامەی لەداردان
deathly/ˈdeθli/adj مەرگ ئاسا
deathly pale ڕەنگ زەردی وەك مردوو
debar/dɪˈbɑː(r)/v ئامێلی– بێبەری دەکا
debase/dɪˈbeɪs/v بەهای کەم دەکاتەوە
debasement/dɪˈbeɪsmənt/n
کەمکردنەوەی بەها/ پیسێتی– گومڕایی

# Dd

D-d/diː/ چوارەم پیتی ئەلفبای ئینگلیزییە
dab/dæb/v - n پاکی دەکاتەوە
١-دەست لێدانێکی هێواش
٢-ماسی٢-خاڵ- نوختە
dabble/ˈdæbl/v ١-تەڕدەکا
دەست و پێی لەناو ئاودا تەڕ دەکا
٢- ئارەزوو دەکا/ خۆی سەرقاڵ دەکا
dabbler/ˈdæblə(r)/n ئارەزووکار-
نەک پیشەکار
dad/dæd/n بابە( بەزمانی منداڵ)
daddy/ˈdædi/n بابە( بەزمانی منداڵ)
daffodil/ˈdæfədɪl/n نێرگز
daft/dɑːft/adj هیچ وپوچ- گەلحۆ
dagger/ˈdægə(r)/n خەنجەر
daily/ˈdeɪli/adj - adv ڕۆژانە
dainty/ˈdeɪnti/adj ناسک- نازدار- نەرم
خواردنی بەلەزەت
dairy/ˈdeəri/n ١- کارگەی شیرەمەنی-
سپیاتی ٢- کۆگای فرۆشتنی سپیاتی
dais/n سەکۆ
daisy/ˈdeɪzi/n بەیبون، گوڵی بەهار
گوڵەکی بچوکی سپی ناو زەردە
dale/deɪl/n دۆڵێکی بچوک(ئەباکوری
ئینگلتەرە)
dally/ˈdæli/v ١- پیاهەڵدەڵێ-
وازی لەگەڵ دەکا ٢- کەمساس دەبێ
تەمبەڵی دەکا لە..
dam/dæm/n - v بەند
بەند دادەنێ- بەربەست دادەنێ
damage/ˈdæmɪdʒ/n - v ١- زیان
٢- بژاردنی دراوی زیان دەگەیەنێ
dame/deɪm/n ١- خاتوون
پلە- پوری- ئافرەتی بەساڵاچوو
٢- پلەی شەرەف..
damn/dæm/v نەفرەت دەکا، نەفرین دەکا
نەفرین، نەفرەتنەهلی ئاگر، ناو جەهەنەم
damnable/ˈdæmnəbl/adj ناشرین-
نەفرەت لێکراو
damnation/dæmˈneɪʃn/n
نەفرەت لێ کردن
نەفرەت لێکراو-
damned/dæmɪd/n
شەیتان- ئەهریمەن
damp/dæmp/adj - v شێ- خوناو
١- تەڕ دەکا٢- دادەمرکێنێ- کز دەکا
damsel/n خاتوون، کچ، شووەنەکردوو
damson/ˈdæmzn/n پلەرخۆخ- هەڵوژە
dance/dɑːns/n - v سەما، سەما دەکا
dancer/ˈdɑːnsə(r)/n سەماکەر
dandruff/ˈdændrʌf/n قرێژ کرێش
danger/ˈdeɪndʒə(r)/n مەترسی
dangerous/ˈdeɪndʒərəs/adj ترسناک،
خەتەرناک- گرنگ
dangle/ˈdæŋgl/v شۆڕدەبێتەوە
dank/dæŋk/adj زۆر شێدار، سرمە
dapper/ˈdæpə(r)/adj ڕێک و پێک،
چالاک- بزێو
dare/deə(r)/v – n ١- بەرەنگاری دەکا-
بەرەنگاری ٢- جەسوری- دەوێری
daredevil/ˈdeədevl/n سەرچڵ-
سەر بەکێشە/ هەلەشە
daring/ˈdeərɪŋ/adj – n وێران، ئازا،
جەسور
dark/dɑːk/adj شاراوە، تاریک،
خەمۆک، ئەسمەر
darken/ˈdɑːkən/v تاریکی دەکا
darkness/ˈdɑːknəs/n تاریکی
darling/ˈdɑːlɪŋ/n گیانە، خۆشەویستەکەم
darn/dɑːn/v پینە دەکا، دەدورێتەوە
dart/dɑːt/n ١- تیر- سارۆخ
٢- بەتیژ دەرچوون ٣- پەیوەستە بەدووری
٤- وەک تیر دەردەچێ، هەڵپە دەکا

cylindrical/səəlındrıkl/adj لولەكی

cynic/ˈsınık/adj گاڵتەجاڕ، قزشمەچی، بێزار

cynical/ˈsınıkl/adj گاڵتەجاڕی

cynicism/ˈsınısızəm/n دنیا بە هەند هەڵنەگرتن گومان لێ بوونی (چاكە) دەكا

cyst/sıst/n ئاوسان/ تورەگە

czar/n تزار، سیزەر

czarevitch/n كوڕی قەیسەر– كوڕە گەورەی قەیسەر

czarevna/n كچی قەیسەر

czarina/n ژنی قەیسەر ئیمپراتۆری ڕووسی

czarism/n قەیسەریەت،سیستەمی دیكتاتۆری

current/ˈkʌrənt/n ١- ڕەوت- تەوژم
٢- شەپۆل، هێز٢- ڕۆیشتوو، ئێستا،
ژمارەی کۆتایی- دواژمارە لە..
curriculum/kəˈrɪkjələm/n
بەرنامەی خوێندن
curry/ˈkʌri/n کاری، بەهارات
curse/kɜːs/n- v ١-نەفرەت، جوێن ٢-شووم
نەفرەت دەکا- جوێن دەدا
cursory/ˈkɜːsəri/adj بروسکە ئاسا،
ڕواڵەتی، سەرپێی
curt/kɜːt/adj (وەڵامێکی) وشك
curtail/kɜːˈteɪl/v کورتی دەکاتەوە،
پوختی دەکا
curtain/ˈkɜːtn/n پەردە، داپۆش
curtsey/ˈkɜːtsi/n - v کڕنۆش دەبا،
کڕنۆش بردن، خۆچەماندنەوە
curve/kɜːv/n - v چەماوە، کەوانەیی،
بادانەوە
cushion/ˈkʊʃn/n - v کوشن، سەرین
کەم دەکاتەوە، هێوردەکاتەوە
custard/ˈkʌstəd/n کاستەر
custodian/kʌˈstəudiən/n پاسەوان،
ئەمیندار
custody/ˈkʌstədi/n ١- چاودێری
٢- زیندانی کردن- حەپس کردن
custom/ˈkʌstəm/n ١- داب- دابو نەریت
٢- بازرگانی- مامەڵە ٣- باجی گومرگی
customarily/adj بەئاسایی
customary/ˈkʌstəməri/adj
ڕاهاتوو، ئاسایی
customer/ˈkʌstəmə(r)/n
هەمیشەکڕیار-مەعمیل
cut/kʌt/n-v ١-بڕین ٢-بڕین
٣- کەمکردن- دابەزاندن ٤- لابردن/
لێکردنەوە
٥- شێوازی قوماش- پەڕۆك
٦- پارچەگۆشت

١- دەبڕێ- گۆشت- قسە
٢- کەمدەکاتەوە-نرخی- دادەبەزێنێ
٣- لادەبا- هەڵدەوەشێنێتەوە
٤- فەرامۆش دەکا، نکوڵی دەکا
٥- دار و درەخت قەڵەم دەکا-
لق و پۆپی دار دەبڕێ
٦- داردەبڕێ- نرخ دادەبەزێنێ
٧- (سەر) دەپەڕێنێ- دادەبڕێ
٨- بێبەش دەکا- میراتی نادات
٩- قسەی دەبڕێ
١٠- پارچە پارچە دەکا- قوماشەکە دەبڕێ-
قیاس وەردەگرێ
١١- وازدەهێنێ ١٢- دەسازێ- ئاسازێ،
دەگونجێ ١٣- دابڕاو- خەمبار
١٤- دەبڕێ- هێڵ هێڵێکیتر دەبڕێ
١٥- لەکاردەکەوێ
cutter/ˈkʌtə(r)/n بڕەر، ئامێری شت بڕین
cute/kjuːt/adj زیرەك، جوامێر،
جوان، خۆشەویست
cutless/n کورتەشێر، شمشێری کورت
cutler/n فرۆشیار/ دروستکەر/ چاکەری
شت و مەکی بڕین
cutlery/ˈkʌtləri/n چەقوو چنگاڵ/
چەقۆکاری
cutlet/ˈkʌtlət/n پارچەگۆشت
cutthroat/ˈkʌtθrəut/adj خوێنڕێژ-
کوژەر
cutting/n - adj ١-ڕێڕەو-ڕاڕەو- تونێل
٢- پارچە(ڕۆژنامە)٣- پارچە (دار)
٤- وشك- بریندارکەر ٥-بڕین
cycle/ˈsaɪkl/n - v ١- خول
٢- زنجیرە(گۆڕانی) ٣- پایسکل
پایسکل داژواسواری پایسکل دەبێ
cyclist/ˈsaɪklɪst/n پایسکل هاژۆ
پایسکلسوار
cyclone/ˈsaɪləun/n زریان
cylinder/ˈsɪlɪndə(r)/n لولەك- قەوان

crystalgazing/n - v دیتنی بەخت، پێشبینی دەکا

crystallization/ˌkrɪstəlaɪˈzeɪʃn/n پرۆسەی بلوراندن بە کریستالکردن- پێگەیین

crystallize/ˈkrɪstəlaɪz/v دەبلورێ- پێدەگا- بەکریستال دەبێ

cub/kʌb/n بەچکەشێر، ناکارامە

cube/kju:b/n ١- شەش پالو

cube root/n ٢- رەگی سێجا

cubed/adj شەشپالوبو

cubic/ˈkju:bɪk/n سێجا

cubicfoot/n قەدی سێجا

cubicle/ˈkju:bɪkl/n بەشێکی بچوکی جیاکراوە لە ژورێکی گەورە

cuckoo/ˈkʊku:/n کوکو- رەقواق

cucumber/ˈkju:kʌmbə(r)/n خەیار- ئاروو- ئاروێ

cuddle/ˈkʌdl/v لەئامێز دەگرێ- لەباوەش دەگرێ- باوەش پێدادەکا

cue/kju:/n ١- ئاماژە بۆ دەست پێکردن ٢- داری بلیارد

cuff/kʌf/n - v ١-سەرقۆڵ، سەردەست ٢- زللەی لێدەدا، شەقی لێدەدا

cuisine/kwɪˈzi:n/n هونەری چێشت لێنان

cul-de-sac/ˈkʌl də sæk/n رێی گیراو- داخراو، شەقامی بەکرێ

culinary/ˈkʌlɪnəri/adj پەیوەست بە چێشت لێنان

culminate/ˈkʌlmɪneɪt/v دەگاتە پۆپکە- لوتکە

culmination/ˌkʌlmɪˈneɪʃn/n لوتکە، پۆپکە

culprit/ˈkʌlprɪt/n تاوانبار- گوناهبار

cult/kʌlt/n سیستەمی ئاینیی، پەرستن

cultivate/ˈkʌltɪveɪt/v ١- زەوی دەکێلێ ٢- پەرەدەستێنێ ٣- گەشەدەکا

cultivation/ˌkʌltɪˈveɪʃn/n زەوی کێلان- جوتیاری- گەشە

cultural/ˈkʌltʃərəl/n رەوشەنبیری- رۆناکبیری، شارستانی

culture/ˈkʌltʃə(r)/n ١- رۆشنبیری- شارستانی ٢- پەروەردە- بەخێوکردن ٣- چاندنی بەکتریا

cumbersome/ˈkʌmbəsəm/adj پەشێو، گران، ماندوکەر

cunning/ˈkʌnɪŋ/adj فێلباز، زۆرزان

cup/kʌp/n ١- کوپ، پیالە ٢- خواردنەوە

cupboard/ˈkʌbəd/n دۆلاب، کەنتۆر

cur/kɜ:(r)/n سەگێکی بێقیمەت- بێمیزاژ

curable/ˈkjʊərəbl/adj چارەی دەکرێ

curate/ˈkjʊərət/n قەشە

curator/kjʊəˈreɪtə(r)/n چاودێر پاسەوان، ئەمیندار

curb/kɜ:b/n - v لغاو، لێواری شۆستە، دادەمرێ/ دادەمرکێنێ

curd/kɜ:d/n شیری مەییو

curdle/ˈkɜ:dl/v دەمەیێ، دەبێتە کەرە، دەترشێ

cure/kjʊə(r)/n - v ١- چارە، چارەسەر چاک دەبێتەوە، چاک دەکاتەوە ٢- دەپارێزێ

curfew/ˈkɜ:fju:/n ١-هاتوچۆ قەدەغەکردن ٢-زەنگ

curiosity/ˌkjʊəriˈɒsəti/n حەز لەقسان خۆتێ هەڵقورتێنەری ، لاپرەسەنی

curious/ˈkjʊəriəs/adj ١- زانخواز ٢- سەیر ٣- لاپرەسەن

curl/kɜ:l/n - v لوژ دەبێ، پوت دەبێ، پورژ دەبێ

curly/ˈkɜ:li/adj لوول، لوژ، پوت

currant/ˈkʌrənt/n کشمش، مێوژی رەزمی

currency/ˈkʌrənsi/n دراو، پارە

٦- دەبڕێ- دەپەڕێتەوە
٧-(پێ) (لەسەریەک) دادەنێ ٨- هێڵێك دەكێشێ
٩- نیشانەی خاچ لەسەر سینگی دادەنێ
١٠- ناوێتە دەكا- تێكەڵ دەكا ١١- تێدەپەڕێ
١٢- بەربەستی دەكا، بەرەنگاری دەكا

crossbar/ˈkrɒsbɑː(r)/n بەربەست- لەمپەر

cross-examination /ˌkrɒs ɪɡˌzæmɪˈneɪʃn/n دواندن- قسەلێوەرگرتن

cross-examine/n دەیدوێنێ- قسەی لێ وەردەگرێ

cross-eyed/ˈkrɒs aɪd/adj خێل

crossing/ˈkrɒsɪŋ/n پەڕینەوە- بەرەباز

cross-legged/ˌkrɒs legd/adj پێ لەسەر پێ دانیشتوو

cross-question/ˌkrɒs kwestʃən/v لێدەپرسێ- پرسینەوەی لەگەڵدەكا

cross-reference/ˌkrɒs ˈrefrəns/n ئاماژە بۆ خوێنەر بە بەشێكی تری هەمان كتێب

cross-roads/ˈkrɒsrəʊdz/n یەكتربڕینی چەند ڕێگایەك مەفرەق، چوارڕیان

cross-section/ˈkrɒs sekʃn/n پانەبڕگە هەر بڕگەیەو چەند جۆرێكی جیا دەنوێنێ

crossword/ˈkrɒswɜːd/n مەتەڵ- مێما

crouch/kraʊtʃ/v هەڵدەكورێ، كرنۆش دەبا خۆی شۆڕ دەكاتەوە تا بگاتە زەوی

crow/krəʊ/n قەلەڕەش- قەلەمشكە

crow/v دەقوقێنێ

crowd/kraʊd/n حەشامەت- ئاپۆرە- قەرەباڵغی

crowd/v خڕدەبێنەوە- قەرەباڵغی دروست دەكەن

crown/kraʊn/n ١-تاج ٢- تۆقەسەر ٣- لوتكە- پۆپكە

crown/v تاج لەسەر دەنێ

crucial/ˈkruːʃl/adj ناخۆش- یەكلاكەرەوە سەرەكی- گەوهەری

crucifixation/ˌkruːsəˈfɪkʃn/n خاچ

crucify/ˈkruːsɪfaɪ/v لەخاچ دەدا

crude/kruːd/n خاو- دەست لێنەدراو

crude-oil/ˈkruːdɔɪl/n نەوتی خاو

cruel/kruːəl/adj توند- تیژ- ڕەق

cruelty/ˈkruːəlti/n توندی دڵڕەقی، سەختی

cruise/n گەشتێكی دەریایی

cruise/v دێت و دەچێ

cruiser/ˈkruːzə(r)/n ڕاوەنەر

crumb/krʌm/n پارچە نان- كێك

crumble/ˈkrʌmbl/v هەڵدەوەشێنێتەوە- ورد دەكا/ هەرەس دێنێ

crumple/ˈkrʌmbl/v دەقۆپێنێتەوە- پێكدێنێتەوە- دەچێتەوە ناویەك

crunch/krʌntʃ/n – v دەكرمێنێ، كاتێكی ناخۆش

crusade/kruːˈseɪd/n هێرشی خاچ پەرستان

crusader/kruːˈseɪdə(r)/n خاچ پەرست

crush/krʌʃ/n - v ١- حەشامەت ٢- شەیدایی كاتی ٣- دەشێلێ- دەگوشێ ٤- سەركوت دەكا

crust/krʌst/n توێكڵ- توێكڵی ڕەق

crutch/krʌtʃ/n شەقرە- داری ڕۆیشتن، داری بن هەنگڵ

crux/krʌks/n كاكڵی بابەت، خاڵی گەوهەری

cry/kraɪ/n - v ١- هاوار، بانگ ٢- گریان، كرووزانەوە ٣-دەگرێ، دەكرووزێتەوە

cryptic/ˈkrɪptɪk/adj نهێنی، شاراوە، لێڵ

crystal/ˈkrɪstl/n كریستاڵ، بلوور

ساریلکە

creed/kri:d/n باوەڕی، ئایین

creek/kri:k/n جۆگە، جۆگەلە، ڕوبار

creep/kri:p/v ١- بەهێمنی دەخشێ- دەجوڵێ ٢- دەلەرزێ

٣- گەڵا دەردەکا (بەسەر دیواردا بڵاودەبێتەوە)

creeper/ˈkri:pə(r)/n ١- خشۆک ٢-لق دەر

creepy/ˈkri:pi/adj ترسناک - تۆقێنەر

cremate/krəˈmeɪt/v مردوو دەسوتێنێ

cremation/krəˈmeɪʃn/n سوتماک- سوتاندنی مردوو

creosote/ˈkri:əsəut/n کریزۆت

crescendo/krəˈʃendəu/adj

١-زیاد بوونی پلەیی ٢-بەرزکردنەوەی دەنگ

crescent/ˈkresnt/n مانگ- هەیڤ

cress/kres/n خوڕەی ئاو/داری بچوکی گەڵاسەوز

crest/krest/n ١- پۆپیتەی کەڵەباب- کەڵەشێر ٢- لوتکە- پۆپکە

crestfallen/ˈkrestfɔ:lən/adj خەمبار، دڵشکاو، بێئومێد

crevasse/krəˈvæs/n درزێکی قووڵ لە بەستەڵەک

crevice/ˈkrevɪs/n درز، شەق

crew/kru:/n دەستەی فڕۆکەوان، دەریاوان

crib/krɪb/n-v ١-بێشکە، لانکەی منداڵ ٢- وەرگێڕانی وشە بەوشە ٣- قوپیە دەکا ٤- ئاخوڕ

cricket/ˈkrɪkɪt/n ١- سیسرکە- کلۆ ٢- یاری کریکیت

crime/kraɪm/n تاوان

criminal/ˈkrɪmɪnl/adj تاوانبار

criminology/ˌkrɪmɪˈnɒlədʒi/n

تاوانناسی- تاوانزانی

crimson/ˈkrɪmzn/adj قورمزی،سوری تێر

cringe/krɪndʒ/v بەیەک دێتەوە، بەچۆک دێ

cripple/ˈkrɪpl/n - v پەککەوتی، شەلە/ پەکیدەکەوێ

crisis/ˈkraɪsɪs/n قەیران، ئارێشە، تەنگوچەڵەمە

crisp/krɪsp/adj ١- خاو- ئاوپۆش ٢- بوژاوە ٣- بزێو- یەکلاکەرەوە

crisscross/ˈkrɪs krɒs/adj لەسەر شێوەی هێڵی یەکبڕ

criterion/kraɪˈtɪəriən/n مەرج، بنچینە- پێوانە- پێوەر

critic/ˈkrɪtɪk/n ڕەخنەگر، کەم و کورتی دۆزەوەر/ دیارکەر

critical/ˈkrɪtɪkl/n ١- ڕەخنەیی ٢- تەنگژە-ناخۆش

criticism/ˈkrɪtɪsɪzəm/n ڕەخنە

criticize/ˈkrɪtɪsaɪz/v ڕەخنەدەگرێ

croak/krəuk/n - v قیڕەی بۆق

قیڕەی دێ، پێشبینی شتی ناخۆش دەکا

crockery/ˈkrɒkəri/n دەفری گلێنە/ قۆری لە قوڕ دروستکراو

crochet/ˈkrəuʃeɪ/n - v کاری چنین

crocodile/ˈkrɒkədaɪl/n تیمساح

crook/kruk/n ١- خوار- چەماوە- گۆپاڵ- قۆچان ٢- فێڵباز- ڕێگر، چەتە

crooked/ˈkrukɪd/adj ١- خوار- چەماوە ٢- بەدخو- ناشەریف- نارێک

croon/kru:n/v بەدەنگێکی لاواز-هێدی- گۆرانی دەڵێ

crop/krɒp/n ١- دانەوێڵە

crop/v بەرهەم دێنێ

٢- لەناکاو ڕوودەدا

٣- قەڵەم کردن- بڕینی کورت

٤- دەلەوەڕێ- دەلەوەڕێنێ

cross/krɒs/n - v ١-نیشانەی (جاران X) یان (کۆ +)

٢- خاچ ٣- تێکەڵە- موتوربەکراو- دووڕەگ ٤- تووڕە ٥- دژ- پێچەوانە

crane/kreɪn/n ١- کەلّە- قولینگ
٢- بەرزکەرەوە- کرێن
٣- ملی بەرزکردەوە یان درێژ دەکاتەوە تا ببینێ
cranium/ˈkreɪniəm/n بەشێک لە کەللەسەر/ مێشک
crank/kræŋk/n ١- کەرەنك٢- ئاوەز نیگەرانی- خۆش- رابواردن- ئۆتۆمبیل هەڵدەکا، کەرەنك دەکا
cranny/ˈkræni/n درز، شەق
crash/kræʃ/n ١- بەریەک کەوتن/ شتێ بەر شتێ دەکەوێ ٢- ئۆتۆمبیل بەریەك دەکەون- دوو ئۆتۆمبیل بەریەك دەکەون
خولێکی راهێنان-مەشقی- چڕ
crate/kreɪt/n-v سندوقی شەحن/ شەحن دەکاتەوە
crater/ˈkreɪtə(r)/n دەمی بورکان- دەمی ئاگرپرژێن
crave/kreɪv/n بەپەرۆش دەبێ، شەیدای دەبێ
craving/ˈkreɪvɪŋ/n شەهوە- زۆرلێ کردنی زایەندی
سوتان بۆ، شەیدا بۆ
crawl/krɔːl/n - v ١- هێواش جولان- لەسەر سینگ خشان
٢- کرۆل- سینگەمەلە- جۆرێکە لە مەلەوانی
١- لەسەر سینگ دەخشێ
٢- بەهێواشی دەڕوا
٣- دادەپۆشێ- حەشامەت پێك دەهێنێ
crayon/ˈkreɪən/n تەباشیری رەنگاورەنگ/ رەنگاورەنگ
craze/kreɪz/v شێت دەبێ- تێکدەچێ
craziness/ˈkreɪzɪnəs/n شێتی، گەلحۆیی، گەوجێتی
crazy/ˈkreɪzi/adj ١- شێت، بێ‌ئەقڵ
٢- شەیدا- عاشق- سوتاو

creak/kriːk/n - v جیڕەجیڕ دەکا/ جیڕە
creaky/ˈkriːki/adj لەرزۆك
cream/kriːm/n - v ١- سەرتو-سەرشیفشك
٢- رۆن- شتێ وەك کرێم- ماکیاژ
٣- رەنگی زەردی کاڵ
سەرتو لەشیر دەگرێ، کەرە لەشیر دروست دەکا
creamy/ˈkriːmi/adj چەور
creas/kriːs/n - v لۆچ- لۆچی ئەێدێ- لۆچ دەبێ
چورچ- چورچ دەبێ
create/kriˈeɪt/v دەخولقێنێ- دروست دەکا
creation/kriˈeɪʃn/n ئافراندن- داهێنان/ خەلّق کردن
creative/kriˈeɪtɪv/adj داهێنەر
creator/kriˈeɪtə(r)/n ئافەریدە- داهێنەر، دروستکار(خوا)
creature/ˈkriːtʃə(r)/n دروستکراو- گیانلەبەر
creche/n دایەنگا، خانەی منداڵانی بیژی، هەتیوخانە
credence/ˈkriːdns/n باوەڕپێکردن
credentials/krəˈdenʃlz/n بەڵگەنامەی باوەڕپێکردن
credibility/ˌkredəˈbɪləti/n باوەڕپێکراوە- جێ‌باوەڕی
credible/ˈkredəbl/adj باوەڕپێکراو
credit/ˈkredɪt/n ١- چاکە- دان بەچاکەدان
٢- ژوانی (پارەدان)٣- قەرد
٤- لیستی ناوانی بەشداربوو
١- بەراست دەزانێ/ باوەڕی پێ دەکا
٢- دان- زێدەکردن
creditable/ˈkredɪtəbl/adj شایەن بە ستایش
creditor/ˈkredɪtə(r)/n قەرددەر
credulity/krɪˈdjuːləti/n زوباوەڕکردن- خۆشباوەڕ
سادە، ساویلکەیی
credulous/kredjələs/n خۆشباوەڕ

county/ˈkaʊnti/n هەرێم، پارێزگا
coup/kuː/n ئیێدان،هەنگاوێکی سەرکەوتوو، کودەتا
couple/ˈkʌpl/n جووت- دووان
couple/v دەبەستێتەوە- جووت دەبێ
couplet/ˈkʌplət/n دوانە
coupon/ˈkuːpɒn/n کۆبۆن
courage/ˈkʌrɪdʒ/n ئازایەتی
courageous/kəˈreɪdʒəs/adj ئازا
courier/ˈkʊriə(r)/n پەیامبەر، رابەر
course/kɔːs/n ١- رارەو- رەوت ٢-ڕوو- ڕووگە ٣- گۆڕەپان ٤- کۆرسات ٥- ژەم ٦- ڕیزێ لە دیوار ٧- خوول
court/kɔːt/n ١- دادگا ٢- گۆڕەپانی تێنس ٣- دەست و پێوەندی شا ٤-حەوش- حەوشە
court/v سرنجم رادەکێشێ- پیاو هەڵدەدا
courteous/ˈkɜːtiəs/adj خۆشدو خۆشگوفتار، گوفتارخۆش، خۆشمەشرەب
courtesy/ˈkɜːtəsi/n خۆشدوویی- گوفتار خۆشی
courtyard/ˈkɔːtjɑːd/n حەوشە
cousin/ˈkʌzn/n ئامۆزا، کچ و کوڕەخاڵ کچە پلك، کوڕەپلك، پورزا
cover/ˈkʌvə(r)/n ١- سەرپۆش- سەرقاپ- داپۆش ٢- پاراستن- چاودێری ٣- زەمانەت- دابین کردن ٤- چەقۆ و چەنگاڵ
cover/v ١- دادەپۆشێ ٢- دەبڕێ(ڕێگا) ٣- نیشانەدەگرێ ٤- دەشارێتەوە
coverage/ˈkʌvərɪdʒ/n داپۆشینی ڕووداوەکان
covert/ˈkʌvət/n شاراوە
covertly/ˈkʌvətli/adj بە پەنهانی، بە شاراوەیی، بەدزی

covet/ˈkʌvət/v چاوی بڕیوەتە...
covetous/ˈkʌvətəs/adj دڵکەرەوە، چاوبڕ، چاوچنۆك
cow/kaʊ/n چێڵ، مانگا
cowboy/ˈkaʊbɔɪ/n گاوان
cowherd/ˈkaʊhɜːd/n گاڕان، مانگاگەل
coward/kaʊəd/n ترسنۆك
cowardice/ˈkaʊədɪs/n ترسنۆکی
cowardly/adv ترسنۆکانە
cower/ˈkaʊə(r)/v لەترسا خۆی پێکدەهێنێتەوە
coy/kɔɪ/adj شەرمن
crab/kræb/n قرژانگی دەریا
crack/kræk/n ١- شەق(لەدیوار) ٢- دەنگەدەنگ ٣- بۆکسێکی توند ٤- شکانی کەم/ شکانی بەشی ٥- دوانی توند- ڕوشکێن، قسەبڕ
crack/v ١- شەق دەکا/ درزی لێ دەکا ٢- دەنگێکی تیژ دەکا، دەنگە دەنگێکی گەورەی لێدێ
cracked/ˈkrækt/adj بێهۆش- بێئاگا
cracker/n ١- بسکویت ٢- ئاگرەیاری- وازی بەئاگر- جۆرە یاریەکە
crackle/ˈkrækl/v تەقەتەق دەکا
cradle/ˈkreɪdl/n لانکە- لانك- بێشکە
cradle/v رادەژەنێ- دادەپۆشێ
craft/krɑːft/n ١- پیشە٢- بەلەم٣- فێڵ
craftsman/ˈkrɑːftsmən/n خاوەن پیشە/ پیشەداری کارامە
crafty/ˈkrɑːfti/n فێڵباز
crag/kræg/n گاشەبەرد، کەور
cram/kræm/v پڕدەکا
cramp/kræmp/v دەماری هەڵدەستێ - قۆلینج دەکا دەماری گورج دەبێ -توند دەکا - بەیەك دێتەوە

corrosion/kəˈrəʊʒn/n داخوران، ژەنگ هەڵێنان

corrugated/ˈkɒrəgeɪtɪd/adj شەپۆلی، پێچاوپێچ

corrupt/kəˈrʌpt/adj-v گەنیو- شێواو- شێوێنراو
١- دەگەنێ ٢- بەرتیلی دەدا

corruption/kəˈrʌpʃn/n خراپەکاری- شێواندن/ بەرتیل دان

corset/ˈkɔːsɪt/n کەمەربەند

cosh/kɒʃ/n - v خوترمە- دار/ بە خوترمە لێی دەدا- زوڕنا

cosmetics/kɒzˈmetɪks/n جوانکاری- کەرەستەی ئارایش- مەکیاج

cosmic/ˈkɒzmɪk/adj گەردوونی

cosmonaut/ˈkɒzmənɔːt/n
رابەری گەردوونی- رابەری کەشتی ئاسمانی

cosmopolitan/ˌkɒzməˈpɒlɪtən/adj
دوور لە ناوچەگەری
بێنیشتمانی- هاونیشتمانی جیهانی

cost/kɒst/n - v تێچوون- بەهاتێدەچێ

costliness/ˈkɒstlɪnəs/n گرانی- گرانبەهایی

costly/adj گران، گرانبەها

costume/ˈkɒstjuːm/n پۆشاک، کۆستم

cosy/ˈkəʊzi/adj گەرم و خۆش- فرە

cot/kɒt/n جێی نوستنی منداڵ

cottage/ˈkɒtɪdʒ/n کۆخ، خانوی بچوکی گوند

cotton/ˈkɒtn/n ١- لۆکە ٢- داو
٣- قوماشی لۆکە ٤- لۆکەی پزیشکی

couch/kaʊtʃ/n - v قەنەفە- جێ- تەخت
(بەهەندێ وشەی دیار).. دەردەبڕێ

cough/kɒf/n – v کۆخە- کۆخەدەکا، دەکۆکێ

could/kəd/modal توانی

council/ˈkaʊnsl/n ئەنجومەن-دیوان-

councillor/ˈkaʊnsələ(r)/n ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی

counsel/ˈkaʊnsl/n شورا- راوێژ

counsellor/ˈkaʊnsələ(r)/n راوێژکار

count/kaʊnt/n - v ١- ژماردن، دەژمێری
٢- ماددەیەک لە ماددەکانی تاوانبارکردن

count-down/ˈkaʊntdaʊn/n دادەژمێری
داژماردن- لەسەرەوە بەرەوخوارەوە

countenance/ˈkaʊntənəns/n
١-هێمنی ٢-ئەدگار ٣-هاندان

countenance/v هانی دەدا، پاڵپشتی دەکا

counter/ˈkaʊntə(r)/n فیشە، بەدیلی دراو لە گەمەی قومار
مێز
دژ- پێچەوانە

counteract/ˌkaʊntərˈækt/v
بەرەنگاری دەکا- بەرهەڵستی دەکا

counterfeit/ˈkaʊntəfɪt/adj -v
دەشێوێنێ- ساختەی دەکا- ساختە

counterfoil/ˈkaʊntəfɔɪl/n
کاغەزی وەرگرتن

counterpart/ˈkaʊntəpɑːt/n
هاوشان، هاوتا، دوژمن- نەیار

counter-productive
/ˌkaʊntə prəˈdʌktɪv/adj
کەمکەرەوەی بەرهەم

counter-revolution
/ˌkaʊntə revəˈluːʃn/n
دژەشۆڕش، شۆڕشی چەواشە

countless/ˈkaʊntləs/adj
لەژمارەنەهاتوو، بێ‌شومار

country/ˈkʌntri/n ١- نیشتمان
٢- لادێ- گوند ٣- زەوی

country house/n خانوی گوندی

countryside/ˈkʌntrisaɪd/n
گوند- لادێ

copious/ˈkəupiəs/adj زۆر، فره

copper/ˈkɒpə(r)/n ١- کانزای مس
٢- رەنگی مس٣- پۆلیس

copulate/ˈkɒpjuleɪt/v سەرجێی دەکا،
جووت دەبێ لەگەڵ

copulation/ˌkɒpjuˈleɪʃn/n سەرجێی،
جووت بوون

copy/ˈkɒpi/n لاسایی کردنەوە-
لەبەرگرتنەوە

copy/v ١-ماددە بۆ چاپلەبەردەگرێتەوە
٢-قۆپیە دەکا ٣-وەك خۆی دەهێنێ

copyright/ˈkɒpiraɪt/n
مافی لەچاپدان و بلاوکردنەوە

coral/ˈkɒrəl/n شیلان، شیلانی-
مەرجان، رەنگ مەرجانی

cord/kɔ:d/n ١- گوریس، پەت، ژێ
٢- پەتی بریرە- دەنگەژێ- ژێیەکانی دەنگ

cordial/ˈkɔ:diəl/adj ١- خۆش دو-
ئاسایی، گەرم ٢- خواردنەوەی بێ‌کحول

cordon/ˈkɔ:dn/n نیتاق- دامێنبەست-
چێشت ئیێنەر

core/kɔ:(r)/n – v ناوك- کاکل/
کاکل دەردێنێ

co-rrespondent/ˌkəu rɪˈspɒndənt/n
هاوبەش لەکاری زینا
(جووت بوونی ناشەرعی)

cork/kɔ:k/n ١- ماددەی فلین- تەپەدۆر
٢- لەمپەری تەپەدۆری

corkscrew/ˈkɔ:kskru:/n شوشەکەرەوە

corn/kɔ:n/n ١- دانەوێڵە- دان
٢- گەنمەشامی٣- پێستی رەق

corner/ˈkɔ:nə(r)/n ١- گۆشە
٢-ناوچە/شوێن ٣- شاردنەوەی شت بۆ گرانی

corner/v ئابلۆقەی دەدا،
رێی لێ بەرتەنگ دەکا

cornet/ˈkɔ:nɪt/n کەرەنا- ئامێری مۆسیقا

corollary/kəˈrɒləri/n ئاکام، ئەنجام

coronary/ˈkɒrənri/adj - n تاجی-
تاجانە- خوێنبەر

coronation/ˌkɒrəˈneɪʃn/n
تاج لەسەرنان، ئاهەنگی تاج لەسەرنان

coroner/ˈkɒrənə(r)/n فەرمانبەری
داد لە هۆی مردنی
گومانلێکراو دەکۆڵێتەوە

corporal/ˈkɔ:pərəl/adj – n دووخەت،
سەردەستە
لاشەیی، جەستەیی

corporation/ˌkɔ:pəˈreɪʃn/n دەستە،
ئەنجومەنی شارەوانی

corps/kɔ:(r)/n چەك، دەستە

corpse/kɔ:ps/n لاشە، کەلەش

corpulent/ˈkɔ:pjələnt/adj قەلەو، گۆشتن

corpuscle/ˈkɔ:pʌsl/n خڕۆکەکانی خوێن

correct/kəˈrekt/adj -v
١- راست- دروست ٢- شیاو- گونجاو
١- چاکدەکاتەوە ٢- سەرکۆنەی دەکا

correction/kəˈrekʃn/n راست کردنەوە

correlate/ˈkɒrəleɪt/v دەبەستێتەوە

correlation/ˌkɒrəˈleiʃn/n هاوپەیوەندی

correspond/ˌkɒrəˈspɒnd/v
١- رازی دەبێ- دەگونجێ لەگەڵ
٢- بە نامە پەیوەندی پێ‌دەکا

correspondence/ˌkɒrəˈspɒndəns/n
نامەگۆڕینەوە
خوێندن بە نامە

correspondent/ˌkɒrəˈspɒndənt/n
پەیامنێر

corridor/ˈkɒrɪdɔ:(r)/n ئارهەیوان، ڕاڕەو

corroborate/kəˈrɒbəreɪt/v
پاڵپشتی دەکا، دوپاتی دەکاتەوە

corrode/kəˈrəud/v دادەخۆڕێ،
ژەنگ هەڵدێنێ

١– گونجاوی، لەبار

٢– هۆکاری ئاسوودەیی– حەسانەوە

٣– ئاوەدەست

convenient/kənˈvi:niənt/adj

گونجاو– لەبار

convent/ˈkɒnvənt/n دێر/ کۆمەڵی رەبەن

convention/kənˈvenʃn/n

١– کۆبوونەوە– کۆنفرانس

٢– داب– نەریت

conventional/kənˈvenʃənl/adj

نەریتی– دابی– تەقلیدی

نەریتگەری

converge/kənˈvɜ:dʒ/v لەیەک خاڵ

یەکدەگرنەوە

conversation/ˌkɒnvəˈseɪʃn/n گفتوگۆ

converse/kənˈvɜ:s/v دەدوێ،

گفتوگۆ دەکا

converse/ˈkɒnvɜ:s/adj دژ

conversion/kənˈvɜ:ʃn/n گۆڕین–

گۆڕان (لەدین وەرگەڕان)

convert/ˈkɒnvɜ:t/n دین گۆڕین

convert/kənˈvɜ:t/v دینێکی تر

وەردەگرێ– دینیخۆی دەگۆڕێ

convertible/kənˈvɜ:təbl/adj

دەکرێ بگۆڕدرێ

دەتوانرێ بگۆڕدرێ

convex/ˈkɒnveks/n قۆقز

convey/kənˈveɪ/v ١– هەڵدەگرێ–

دەگوازێتەوە ٢– دەگەیەنێ

٣– خاوەندارێتی زەوی وزار لەکەسێکەوە

بۆکەسێکیتر دەگوازێتەوە.

conveyance/kənˈveɪəns/n

١– گواستنەوە– گەیاندن ٢– بارهەڵگر

٢– بەڵگەنامەی گواستنەوەی زەوی و زار

conveyor/kənˈveɪə(r)/n گوازەر–

گەیەنەر

convict/kənˈvɪkt/v تاوانباری دەکا،

گوناهباری دەکا

تاوانەکەی لەسەر دەچەسپێنێ.

گوناهەکەی لەسەر ساخ دەکاتەوە.

convict/kɒnvɪkt/n گوناهبار، حوکمکراو

conviction/kənˈvɪkʃn/n

١– گوناهبارکردن

٢– رازیکردن٣– باوەڕ

convince/kənˈvɪns/v قایلی دەکا،

قەناعەتی پێدێنێ

convivial/kənˈvɪviəl/adj قۆشمەچی،

گاڵتەچی، پڕوخۆش

convoy/ˈkɒnvɔɪ/n کاروانی دەریایی،

زەمینی یان ئاسمانی ژێر چاودێری

convoy/v یاوەری دەکا، چاودێری دەکا

convulse/kənˈvʌls/v دەمەژێ، رادەچڵەکێ

قۆڵنجی هەڵدەستێ، گرژ دەبێ

convulsion/kənˈvʌlʃn/n گرژبوون،

چوونە ئاوییەک

نیگەرانییەکی توند

cook/kʊk/v لێدەنێ

cooker/ˈkʊkə(r)/n لێنەر/ئامێری

چێشت لێنان

cookery/ˈkʊkəri/n هونەری چێشت لێنان

cool/ku:l/adj سارد، ساردی، شێ

coolness/ˈku:lnəs/n ساردبوونەوە، ساردی

co-op/ˈkəʊɒp/n هەرەوەزی–

کۆمەڵەی هەرەوەزی/ هاوکاری

cooperator/kəʊˈɒpəreɪtə(r)/v

هاوکاری دەکا، هەرەوەزی دەکا

cooperation/kəʊˌɒpəˈreɪʃn/n

هاوکاری، هەرەوەزی

cooperative/kəʊˈɒpərətɪv/adj

هاوکار

cop/kɒp/n - v پۆلیس– دەگرێ

cope/kəʊp/v دەرەستێتە کاری خۆی

چارەسەری کێشەی خۆی پێدەکرێ

**continuation/kənˌtɪnjuˈeɪʃn/n** بەردەوامی، بەردەوام بوون

**continue/kənˈtɪnjuː/v** بەردەوام دەبێ لەسەر، بەردەوام دەبێ

**continuity/ˌkɒntɪˈnjuːəti/n** بەردەوامی

**continuous/kənˈtɪnuəs/adj** بەردەوام

**contorted/adj** چەماوە– بەیەك هاتوو

**contour/ˈkɒntʊə(r)/n** هێڵی جیاکەرەوە،

**contra/pref** دژ

**contraband/ˈkɒntrəbænd/n** یاساغ– قەدەغە– قاچاغ

**contraception/ˌkɒntrəˈsepʃn/n** دژەمندالبوون

**contraceptive/ˌkɒntrəˈseptɪv/adj** رێگری مندالبوون

**contract/ˈkɒntrækt/n** بەرەنگاری– بۆند

**contract/kənˈtrækt/v** ١– بەلێن دەبەستێ
٢– قەرد وەردەگرێ
٣– دەچێتەوە ئاویەك، بچوکتری دەکا
٤– تووشی نەخۆشی دەبێ

**contraction/kənˈtrækʃn/n**
١– بچوك بوونەوە– چوونەوە ئاویەك
٢– گرژبوون
٣– کورتکراوە– کورتکردنەوەی(وشە)

**contradict/ˌkɒntrəˈdɪkt/v** بەرپەرچی دەداتەوە، بەدرۆی دەخاتەوە– لەدژی دەبێ

**contradiction/ˌkɒntrəˈdɪkʃn/n** دژێتی، ناکۆك بوون– ناتەبایی

**contradictory/ˌkɒntrəˈdɪktəri/adj** دژ، ناتەبا، ناکۆك

**contralto/kənˈtræltəʊ/n** کۆنترالتۆ– دەنگ نزمە(ئافرەت)

**contraption/kənˈtræpʃn/n** پێکهاتەی ئامێری سەیر

**contrary/ˈkɒntrəri/adj** پێچەوانە
١– دژ٢– کەللەرەق– عیناد

**contrast/kənˈtrɑːst/v - n** جیاوازی دەردەخا– جیاوازە لە

**contribute/kənˈtrɪbjuːt/v** ١– دەبەخشێ
٢– بەشداری دەکا– رۆڵی خۆی دەبینێ
٣– (بەنوسین) بەشداری دەکا

**contribution/ˌkɒntrɪˈbjuːʃn/n** بەشداری، بەشدار

**contributory/adj** بەرەو، بەشدار

**contrite/ˈkɒntrɑɪt/adj** تۆبەکار، پەشیمان لەدڵەوە

**contrition/kənˈtrɪʃn/n** تۆبە– پەشیمان بوونەوە لە گوناه

**contrive/kənˈtraɪv/v** دادەهێنێ– دایدەهێنێ

**control/kənˈtrəʊl/n - v** ١– کۆنترۆل– ئاراستە
٢– ئامێری رێکخەر و زەبت کردن
١– رێکی دەخا ٢– دەست بەسەردا دەگرێ

**controversial/ˌkɒntrəˈvɜːʃl/adj** گفتوگۆ هەڵگر
مشت وەڕ هەڵدەگرێ

**controversy/ˈkɒntrəvɜːsi/n** مشتومڕ

**conundrum/kəˈnʌndrəm/n** شاراوە، مەتەڵ

**convalesce/ˌkɒnvəˈles/n** بەرەو چاکبوونەوە دەچێ

**convalescence/ˌkɒnvəˈlesns/n** چاك بوونەوە

**convection/kənˈvekʃn/n** هەڵگر– بارکە

**convector/kənˈvektə(r)/n** ئامێری گەرمکردن

**convene/kənˈviːn/v** کۆدەبێتەوە، کۆبونەوە دەبەستێ

**convenience/kənˈviːniəns/n**

construct/kən'strʌkt/v بینادەكا
construction/kən'strʌkʃn/n
١- دروست كردن، بونیادنان ٢- بینا
٣- لێكدانەوە، شرۆڤەكردن٤- بەستنەوە
constructive/kən'dtrʌktɪv/adj
پتەو، چاك، سودبەخش
consul/'kɒnsl/n كۆنسوڵ/ قونسل
consular/'kɒnsjələ(r)/n كۆنسوڵ/
قونسلی، ئەوەی كاری قونسلیە دەكا
consulate/'kɒnsjələt/n قونسلیە/
پایەی قونسلیاتی
consult/kən'sʌlt/v راوێژ دەكا
consultant/kən'sʌltənt/n راوێژكار
consultation/,kɒnsl'teɪʃn/n
راوێژكاری
consume/kən'sju:m/v بەكاردێنێ،
لەناودەبا
consumer/kən'sju:mə(r)/n
بەرهەمخۆر- مشەخۆر
consummate/kən'sʌmət/v - adj
تەواو دەكا - تەواو- بێكێماسی
consummation/,kɒnsə'meɪʃn/n
تەواوكردن- ئەنجامدان
consumption/kən'sʌmpʃn/n
١- بەكارهێنان ٢- سیل
contact/'kɒntækt/n
١- دەست ئێدان- پەیوەندی
٢- ناسیاو٣- كونتاكت
contagion/kən'teɪdʒən/n
ئێكرەوە- ئێگرتنەوە
contagious/kən'teɪdʒəs/adj گرەوە-
نەخۆشی دەگوازێتەوە- گوازەر
contain/kən'teɪn/v - n تێیدا- دەگرێ-
رادەگرێ- لەخۆدەگرێ
container/kən'teɪnə(r)/n دەفر- قاپ
contaminate/kən'tæmɪneɪt/v
پیس دەكا
contamination/kən,tæmɪ'neɪʃn/n
پیس بوون
contemplate/'kɒntəmpleɪt/n - v
١- تێ‌فكرین- دیقەت دان/
تێ‌دەفكرێ- دیقەت دەدا ٢- دەپەوێ
contemplation/,kɒntəm'pleɪʃn/n
تێ‌فكرین- نیەت- مەبەست
contemporary/kən'temprəri/adj
هاوچەرخ- سەردەمی
contempt/kən'tempt/v - n
ریسوادەكا، شەرمەزار دەكا
ریسوایی- شەرمەزاری- تەمبێ‌كردن
contemptible/kən'temptəbl/adj
هیچ و پوچ، بێ‌قیمەت
ریسوا، بێ‌ئابرو
contend/kən'tend/n ١- بەرەكانێ دەكا
٢- مشت ومڕ دەكا
content/'kɒntent/v قایل دەبێ-
رازی دەبێ
content/n ناوەڕۆك
contented/kən'tentɪd/adj قایل،
رازی، دڵنیا
contention/kən'tenʃn/n مشت ومڕ-
ئاكۆكی- بانگاشە
contentment/n قەناعەت، رازی‌بوون
contest/kən'test/n - v بەرەكانێ- كەمە-
رازی
١- مشت ومڕ دەكا- نكۆڵی دەكا
٢- پێشبڕكێ دەكا
context/'kɒntekst/n دەق، چوارچێوە،
دەوروبەر، رەوش
continent/'kɒntɪnənt/n كیشوەر
continental/,kɒntɪ'nentl/adj كیشوەری
contingency/kən'tɪndʒənsi/n
ئاكاری، لەپڕ
شیمانەی رودانی دەكرێ
continual/kən'tɪnjuəl/adj بەردەوام

conservatory/kən'sɜːvətri/n

١–خانووی شووشە بۆ ڕووەك

٢–پەیمانگای هونەری مۆسیقا

consider/kən'sɪdə(r)/v

١– بیردەکاتەوە، تێدەفکرێ

٢– وا دادەنێ، وا حساب دەکا، رەچاو دەکا

٣– حسابی بۆ دەکا، لە زەنی خۆی دادەنێ

considerable/kən'sɪdərəbl/adj

زۆر، گەورە، رەچاوکراو

considerably/kən'sɪdərəbli/adv

بەزۆری، زۆر

considerate/kən'sɪdərət/adj

بەهەست

consideration/kən'sɪdə'reɪʃn/n

١– گرنگی دان ٢– بەهەست

٣– پاداشت، بژاردن

consign/kən'saɪn/v دەنێرێ

consignment/kən'saɪnmənt/n

ناردن/ بار

consist/kən'sɪst/v پێکدێ لە

consistency/kən'sɪstənsi/n

چڕی، یەکگرتوویی

consistent/kən'sɪstənt/adj گونجاو،

شیاو

consolation/ˌkɒnsə'leɪʃn/n دلدانەوە،

دلنەوایی‌کردن

console/kən'səʊl/v دڵی‌دەداتەوە،

سەرەخۆشی لێدەکا

console/'kɒnsəʊl/n خیزانەی رادیۆ–

کەوانەی تاقچکە

consolidate/kən'sɒlɪdeɪt/v

دەچەسپێنێ، پاڵپشتی دەکا

consonant/'kɒnsənənt/n نەبزوێن

consort/'kɒnɔːt/n هاوڵف، ژن– مێرد،

میر و پاشا

consort/kən'sɔːt/v یاوەری دەکا،

لەگەڵی دەژی

conspicuous/kən'spɪkjuəs/adj

دیار، روون، بەرچاو

conspiracy/kən'spɪrəsi/n پیلان

conspirator/kən'spɪrətə(r)/n پیلانگێر

conspire/kən'spaɪə(r)/v پیلان دەگێڕێ،

هاوکاری– دوژمن– دەکا

constable/'kʌnsrəbl/n پۆلیس،

نەفسەری پۆلیس

constabulary/kən'stæbjələri/n

هێزی پۆلیس

constancy/'kɒnstənsi/n نەگۆڕان–

وەك خۆی– وەفایی– وەفاداری

constant/'kɒnstənt/adj نەگۆڕ/

بەوەفا– بەردەوام

constantly/'kɒnstəntli/adv

بەبەردەوامی– هەمیشە

constellation/ˌkɒnstə'leɪʃn/n

بورجی ئاسمانی/ کۆمەڵی ئەستێرە

consternation/ˌkɒnstə'neɪʃn/n

تۆقاندن، ترس

constipated/'kɒnstɪpeɪtɪd/adj

قەبز بوو

constipation/ˌkɒnstɪ'peɪʃn/n قەبزی

consistency/kən'stɪtjuənsi/n

ناوەندی هەڵبژاردن

مەڵبەندی هەڵبژاردن

constitute/'kɒnstɪtjuːt/v

١– پێکدەهێنێ– دروست دەکا

٢– دیار دەکا

constitution/ˌkɒnstɪ'tjuːʃn/n

١– دەستووری حکومەت ٢– بونیاد

constitutional/ˌkɒnstɪ'tjuːʃənl/adj

دەستووری، بونیادی

constrain/kən'streɪn/v ناچاری دەکا

constraint/kən'streɪnt/n

ناچارکردن– زۆرلێکردن

constrict/kən'strɪkt/v تەنگەبەری–

تەنگی دەکا، گرژی دەکا

جەنجاڵ
congestion/kən'dʒestʃən/n داخران
قەرەباڵغی، حەشامەت، ئاپۆرە
congratulate/kən'grætʃuleɪt/v
پیرۆزبایی دەکا
congratulation/kən,grætʃu'leɪʃn/n
پیرۆزبایی
congregate/'kɒŋgrɪgeɪt/v کۆدەکاتەوە
خڕدەکاتەوە
congregation/,kɒngrɪ'geɪʃn/n
کۆمەڵ، حەشامەت
congregational/,kɒngrɪ'geɪʃnl/adj
بەکۆمەڵ
congress/'kɒŋgres/n کۆنگریس،
کۆنفرانس، ئەنجومەن
Congress/n کۆنگریسی ئەمریکی
conical/'kɒnɪkl/adj قوچەکی
conjecture/kən'dʒektʃə(r)/n
خەملاندن، قرساندن
conjecture/v دەخەملێنی، دەقرسێنی
conjugal/'kɒndʒəgl/adj لەبارەی ژن
ومێردایەتی/ پەیوەندی هاوسەرێتی/ سێکسی
conjugate/'kɒndʒəgeɪt/v ڕۆنانی فرمان
conjugation/,kɒndʒu'geɪʃn/n ڕۆنان/
ڕێزمان
conjunction/kən'dʒʌŋkʃn/n
١- یەکێتی ٢- پەیوەندی/ پیتی بەستنەوە
conjure/'kʌndʒə(r)/n جادوگەری-
conjure/v جادودەکا، نوشتە دەکا
conjure up/v بانگی دەکا، داوای دەکا
تووشی تەلیسمی دەکا
connect/kə'nekt/v دەبەستێتەوە
connection/kə'nekʃn/n ١- بەستنەوە
٢- پەیوەندی/ بەستنەوەی ژیری
٣- هۆکاری گواستنەوە ٤- خزمایەتی
connoisseur/,kɒnə'sɜ:(r)/n شارەزا

پسپۆر لە چەشتن
conquer/'kɒŋkə(r)/v دەباتەوە،
دەبەزێنی، دەشکێنێ
conqueror/'kɒŋkərə(r)/n بروەوە،
شکێنەر، سەرکەوتوو، وڵاتگر
conquest/'kɒŋkwest/n وڵاتگیری،
سەرکەوتن
conscience/'kɒnʃəns/n ویژدان
conscientious/,kɒnʃi'enʃəs/adj
بەویژدان
conscious/'kɒnʃəs/adj وریا،
وشیار، بەئاگا
consciousness/'kɒnʃəsnəs/n
وشیاری، بەئاگایی
conscript/kən'skrɪpt/v دەیگری بۆ
سەربازی، سەربازی پێدەکا
conscription/kən'skrɪpʃn/n
سەربازگری زۆرەملێ
consecrate/'kɒnsɪkreɪt/v ١-تەرخان
دەکا- پیرۆزی دەکا
consecutive/kən'sekjətɪv/adj
لەدوای یەك، ئاییندە، پاش هاتوو
consent/kən'sent/n ڕازیبوون،
قایل بوون/
consent/v قایل دەبێ
consequence/'kɒnsɪkwəns/n
١- ئاکام- ئەنجام
٢- گرنگی ٣- گرنگ
consequent/'kɒnsɪkwənt/adj
لەئاکام پەیدابوو، هەڵقوڵاو- سەرچاوەگرتوو
consequently/'kɒnsɪkwəntli/adv
لەئاکامی، بۆیە، لەئەنجام
conservation/,kɒnsə'veɪʃn/n
پاراستن
conservative/kən'sɜ:vətɪv/adj
١- وریا، خۆپارێز، بەئاگا
٢- پارتی پارێزگاران

condole/kənˈdəʊl/v دڵی دەداتەوە دڵنەوایی دەکا، سەرەخۆشی لێ دەکا
condolence/kənˈdəʊləns/n سەرخۆش کردن، پرسە، تازیە
condone/kənˈdəʊn/n - v لێبوردن، لێدەبوری
conduct/ˈkɒndʌkt/n ١- رەفتار ٢- بەرێوەبردن ٣- سەرکردایەتی، رابەرایەتی، رێنیشاندەری
conduct/kənˈdʌkt/v ١- رەفتاردەکا هەڵس و کەوت دەکا ٢- بەرێوە دەبا، رادەپەڕێنێ ٣- ئاراستە دەکا ٤- سەرکردایەتی‌دەکا
conductor/kənˈdʌktə(r)/n ١- پلیت بڕ ٢- سەرۆکی تیپی مۆسیقا ٣- گەیەنەر- گوازەر
cone/kəʊn/n قوچەک- شێوەقوچەکی/ گۆزە/ سنوبەر
confectioner/kənˈfekʃnə(r)/n حەلواچی
confectionery/kənˈfekʃənəri/n شیرینەمەنی- دوکانی حەلوا
confederacy/kənˈfedərəsi/n هاوپەیمانی/بەشدار
confederate/kənˈfedərət/adj هاوپەیمان/ بەشدار
confer/kənəfɜː(r)/v دەبەخشێ- رێزدەدا
conference/ˈkɒnfərəns/n کۆنفرانس
confess/kənˈfes/n دان دەنێ- رادەگەیەنێ
confession/kənˈfeʃn/n دانپێدانان
confetti/kənˈfeti/n پارچە کاغەزی رەنگاورەنگ
confide/kənˈfaɪd/v نهێنی لا دەدرکێنێ
confidence/ˈkɒnfɪdəns/n ١- باوەڕی ٢- نهێنی٣- باوەڕبەخۆبوون
confident/ˈkɒnfɪdənt/adj دڵنیا، باوەڕ بەخۆ
confidential/ˌkɒnfɪˈdenʃl/adj نهێنی، تایبەتی
confine/kənˈfaɪn/v ١- بەرتەنگ دەکا، دیاردەکا ٢- زیندانی دەکا
confinement/kənˈfaɪnmənt/n زیندان
confirm/kənˈfɜːm/v ١- پاڵپشت دەکا، دوپات دەکا ٢- دەچەسپێنێ
confirmation/ˌkɒnfəˈmeɪʃn/n دوپات کردن
confiscate/ˈkɒnfɪskeɪt/v دەست بەسەردا دەگرێ
confiscation/ˌkɒnfɪˈskeɪʃn/n دەست بەسەرداگرتن
conflict/ˈkɒnflɪkt/n بەریەک کەوتن- ململانێ
conflict/v بەریەک دەکەوێ ناسازێ، ململانێ دەکا لەگەڵ
conform/kənˈfɔːm/v دەسازێ لەگەڵ
conformity/kənˈfɔːməti/n سازان- گونجان
confound/kənˈfaʊnd/v ١- هەراسانی دەکا، تێک دەچێ ٢- نەفرەتی لێ دەکا ٣- دەشکێ
confront/kənˈfrʌnt/v بەرەنگاری دەبێ رووبەرووی دەبێ
confrontation/ˌkɒnfrʌnˈteɪʃn/n رووبەڕووبوونەوە
confuse/kənˈfjuːz/v دەشێوێنێ، دەشێوێ
confusion/kənˈfjuːʒn/n لێتێک چوون سەرئاڵۆز بوون
congeal/kənˈdʒiːl/n - v مەیین- دەمەیێ، رەق دەبێ
congenial/kənˈdʒiːniəl/adj ئیسک سووک/بەدڵ، هاوگونجاو
congested/kənˈdʒestɪd/adj قەرەباڵغ-

concave/kɒnˈkeɪv/adj قوپاو/رووچاڵ

conceal/kənˈsiːl/v دەشارێتەوە، حەشاردەدا، مەڵاس دەدا

concealment/kənˈsiːlmənt/n شاردنەوە

concede/kənˈsiːd/v مل کەچ دەکا، وازدەهێنێ، سەردەنوێنێ

conceit/kənˈsiːt/n لەخۆباییبوون، کەیف بەخۆهاتن

conceited/kənˈsiːtɪd/adj لەخۆبایی- بەفیز

١- دالغە ئیدەدا-

conceive/kənˈsiːv/v ڕادەمێنێ ٢- سکی پڕ دەبێ

concentrate/ˈkɒnsntreɪt/v جەخت دەکا، چڕ بەندی دەکا لەسەر، زەنی کۆدەکاتەوە

concentration/ˌkɒnsnˈtreɪʃn/n جەخت کردن، حەشامەتی سەربازی

concept/ˈkɒnsept/n چەمك، بیرۆکە

concern/kənˈsɜːn/n – v ١- گرتن- نیگەرانی ٢- کار- پەیوەست ٣- نیگەران دەبێ ٤- خۆش دەوێ- پەیوەستی دەبێ ٥- دەکۆڵێتەوە لە

concerning/kənˈsɜːnɪŋ/n پەیوەست بە، دەربارەی

concert/ˈkɒnsət/n ١- ئاهەنگی مۆسیقا ٢- سازان- گونجان

concerto/kənˈtʃɜːtəʊ/n کۆنسێرتۆ

concession/kənˈseʃn/n زێدەماف، دەست بەردار بوون، وازهێنان

conciliation/kənˌsɪliˈeɪʃn/n ئاشتبوونەوە- ئاشتەوایی

conciliatory/kənˈsɪliətəri/adj ئاینلکاری

concise/kənˈsaɪs/adj کورتە، پوختە

conclude/kənˈkluːd/v ١- کۆتایی پێدێنێ، (پەیمان) دەبەستێ ٢- بەدەست دێنێ- بۆی دەردەکەوێ- دەکاتە

conclusion/kənˈkluːʒn/n ئاکام، کۆتایی، کورتە، بەستنی(پەیمان)

conclusive/kənˈkluːsɪv/adj یەکلاکەرەوە، کۆتایی

concoct/kənˈkɒkt/n - v داهێنان، دروست کردن- دادەهێنێ

concord/ˈkɒŋkɔːd/n ڕێکەوت- ئاشتەوایی

concrete/ˈkɒŋkriːt/adj – v کۆنکرێت- چیمەنتۆ، واقیعی- بەرجەستە- کۆنکرێت دەکا

concur/kənˈkɜː(r)/v دەگونجێ لەگەڵ/ دەسازێ

concussion/kənˈkʌʃn/n لەرزین- هەژان

condemn/kənˈdem/v ١- زیندانی دەکا- حوکمی بەسەردا دەدا- ڕیسوای دەکا/ سەرکۆنەی دەکا ٢- بڕیاردەدا بە کەڵك نەهاتنی

condemnation/ˌkɒndemˈneɪʃn/n گوناهبارکردن سەرکۆنەکردن، ڕیسواکردن

condensation/ˌkɒndenˈseɪʃn/n خەستی- پەتی- چڕی- شێ

condense/kənˈdens/v ١- کورت دەکاتەوە ٢- خەستی دەکاتەوە

condescend/ˌkɒndɪˈsend/n وازدەهێنێ دەست بەرداری دەبێ، کڕنوش دەبا

condescension/ˌkɒndiˈsenʃən/n وازهێنان- دەست هەڵگرتن

condiment/ˈkɒndɪmənt/n بەهارات

condition/kənˈdɪʃn/n ١- ڕەوش- بار ٢- بارودۆخ ٣- مەرج

condition/v ڕادەهێنێ

conditional/kənˈdɪʃənl/adj مەرجی

complain/kəmˈpleɪn/v سکالا دەکا

complaint/kəmˈpleɪnt/n ١- سکالا- پرۆتێست ٢- نەخۆشی- کێماسی

complement/ˈkɒmplɪmənt/n
١- تەواوکەر
٢- گوزارە(رێزمان) تەواوکەر

complete/kəmˈpli:t/v تەواو دەکا- تەواو

completion/kəmˈpli:ʃn/n تەواوکردن

complex/ˈkɒmpleks/adj ئالۆز- ئێکدراو- کۆمەڵگا
گرێی دەروونی

complexion/kəmˈplekʃn/n پێست، روخسار

complexity/kəmˈpleksəti/n ئالۆزی

compliance/kəmˈplaɪəns/n گوێڕایەڵی

complicate/ˈkɒmplɪkeɪt/v ئالۆز دەکا
دژواردەکا، گران دەکا

complication/ˌkɒmplɪˈkeɪʃn/n
ئالۆزی، زیانی زێدە

compliment/ˈkɒmplɪmənt/n
ستایش، پیاهەڵدان

complimentary/ˌkɒmplɪˈmentri/adj
ستایشکار، پیاهەڵدەر، خۆڕایی

comply/kəmˈplaɪ/v بەپیرەوەهات،
پێگیری دەکا، گوێڕایەل دەبێ

compose/kəmˈpəʊz/n رەگەز، بەش

compose/v ١- پێکدەهێنی- پێکدێ
٢- دادەهێنێ- رێکدەخا- دەهۆنێتەوە
٣- تایپ دەکا- چاپ دەکا
٤- ئەدارەك دەکا- رێك دەخا

composed/kəmˈpəʊzd/adj هێمن، خۆگر

composer/kənˈpəʊzə(r)/n
ئاواز دانەر- مۆسیقا دانەر

composition/ˌkɒmpəˈzɪʃn/n
١- پێکهێنان ٢- دارشتن
٣- هونەری دانانی مۆسیقا
٤- چاپلێدان- چاپگەری

composure/kəmˈpəʊʒə(r)/n
هێمنی- هۆگری

compound/ˈkɒmpaʊnd/n - adj - v
١- تێکەڵ دەکا ٢- یەکلا دەکاتەوە
١- لێکدراو٢- تێکەڵە- ئاوێتە

comprehend/ˌkɒmprɪˈhend/v
١- تێ دەگا ٢- دەگرێتەوە

comprehensible
/ˌkɒmprɪˈhensəbl/adj
تێگەیشتنی ئاسانە، دەرك پێدەکرێ

comprehension/ˌkɒmprɪˈhenʃn/n
دەرك پێکردن
تێگەیشتن، وەرگرتن

comprehensive/ˌkɒmprɪˈhensɪv/adj
سەراپاگیر، هەمەلایەن، گشتگیر

compress/kəmpres/v – n گوشاری
دەخاتە سەر
پاڵەپەستۆی دەخاتە سەر، دەپەستێوێ
گوشار، پاڵەپەستۆ، پەستان

compression/kəmˈpreʃn/n
گوشار، لێکدان

comprise/kəmˈpraɪz/v دەگرێتەوە،
پێکدێ

compromise/ˈkɒmprəmaɪz/n
سازش کردن

compulsion/kəmˈpʌlʃn/n
ناچارکردن

compulsive/kəmˈpʌlsɪv/adj نائیرادی
ناچاری- زۆرەملی، خورتی

compulsory/kəmˈpʌlsəri/adj
ناچاری، زۆرەملێی

computer/kəmˈpju:tə(r)/n کۆمپیوتەر

comrade/ˈkɒmreɪd/n هاوڕێ، هەڤاڵ
یاوەر برادەر

con/kɒn/v ١- دەوردەکاتەوە
٢- گزی دەکا، فێڵ دەکا٣- بەدل فێردەبێ

pros and cons چاکە و خراپە

١- (بیرورا) ئاڵوگۆڕ دەكا

٢- پەیوەندی دەكا بە

communication/kəˌmjuːnɪˈkeɪʃn/n

١- ئاڵوگۆڕكردنی زانیاری

٢- پەیام ٣- گەیاندن

communion/kəˈmjuːniən/n

١- هاوبەشی كردن

٢- گروپێكی دینی كە هەمان باوەڕیان هەبێ

communism/ˈkɒmjunɪzəm/n

كۆمۆنیزم- شیوعیەت

communist/ˈkɒmjənɪst/adj

شیوعی- ئەندامی پارتی شیوعی

community/kəˈmjuːnəti/n كۆمەڵگا،

كۆمەڵە

كۆمەڵەی نێودەوڵەتی- جالیە- رەوەند

commute/kəˈmjuːt/v دەگۆڕێ-

سووك دەكا

commuter/n دانیشتووی دەوروبەر رۆژانە

بەرەو ناوەندی شار دەچێ

compact/kəmˈpækt/adj - n چڕ، پتەو/

پەیمان/ قوتوی پۆدرە

companion/kəmˈpæniən/n یاوەر،

هاوڕێ

companionship/kəmˈpæniənʃɪp/n

یاوەری، هاوڕێیی

company/ˈkʌmpəni/n ١- هاوڕێیی-

یاوەری ٢- كۆمەڵە

٣- كۆمپانیا ٤- یەكەی سەربازی

comparable/ˈkɒmpərəbl/adj

هاوشێوە- بەراوردكراو

comparative/kəmˈpærətɪv/adj

بەراورد، رێژەیی

compare/kəmˈpeə(r)/v بەراوردی دەكا

comparison/kəmˈpærɪsn/n بەراورد/

بەراوردكاری

compartment/kəmˈpɑːtmənt/n

ڤارگۆن

ڤارگۆنی شەمەندەفەر، ژوورۆكە

compass/ˈkʌmpəs/n ١- قیبلەنوما

٢- پەرگال ٣- ئاست

compassion/kəmˈpæʃn/n رەحمەت،

بەزەیی، خۆشەویستی

compassionate/kəmˈpæʃənət/adj

میهرەبان، بەبەزەیی

compatibility/kəmˌpætəˈbɪləti/n

سازان، گونجان

compatible/kəmˈpætəbl/adj

گونجاو، لەبار

compatriot/kəmˈpætriət/n

هاونیشتمانی

compel/kəmˈpel/v ناچاری دەكا،

زۆری لێ دەكا كە

compensate/ˈkɒmpenseɪt/v

قەرەبووی دەكا، دەبژێرێ

compensation/ˌkɒmpenˈseɪʃn/n

قەرەبووكردن، بژاردن

compere/kəmˈpeə(r)/n

ئامەنگێڕ- بێژەر-

بەرنامە پێشكەش دەكا

compete/kəmˈpiːt/v پێشبڕكێ دەكا

competence/ˈkɒmpɪtəns/n توانست

competent/ˈkɒmpɪtənt/adj بەتوانا،

بەكارامە

competition/ˌkɒmpəˈtɪʃn/n پێشبڕكێ

competitor/kəmˈpətɪtə(r)/n

پێشبڕكێكار

compile/kəmˈpaɪl/v دەپۆلێنێ،

رێك دەخا- كۆدەكاتەوە

complacency/kəmˈpleɪsnsi/n

كەمتەرخەمی- لەخۆڕازیی

complacent/kəmˈpleɪsnt/adj

لەخۆڕازی

خۆپەسەند- كەیف بەخۆهاتو

دەست دەگرێ بەسەر/ گل دەداتەوە، سەربازی
ئاکا، داگیر دەکا

commandment/kəˈmɑːndmənt/n
فەرمان– ڕاسپاردە، وەسیەت

commemorate/kəˈmeməreɪt/v
زیندووکردنەوەی یادی دەکا/
ئاهەنگ دەگێڕێ بەیادی

commemorative/kəˈmemərətɪv/adj
یادگاری

commence/kəˈmens/v دەست پێدەکا،
دەست دەکا

commencement/kəˈmensmənt/n
دەست پێکردن–بەرایی

commend/kəˈmend/v پێیدا هەڵدەڵێ
ستایشی دەکا

commendable/kəˈmendəbl/adj
ستایش هەڵدەگرێ– شایەنی ستایشە

commendation/ˌkɒmenˈdeɪʃn/n
چاکە

comment/ˈkɒment/n – v
لێدوان– تێبینی
دەدوێ لەسەر، ڕاڤەدەکا، تێبینی دەدا لەسەر

commentary/ˈkɒməntri/n
لێدوان– ڕاڤەکردن

commentator/ˈkɒmənteɪtə(r)/n
دوانبێژ– ڕاڤەکەر

commerce/ˈkɒmɜːs/n بازرگانی–
کڕین و فرۆشتن

commercial/kəˈmɜːʃl/adj بازرگانیی

commercialism/kəˈmɜːʃəlɪzəm/n
جەخت لەسەر قازانج
کاری بازرگانی

commiserate/kəˈmɪzəreɪt/v
دڵی دەداتەوە، دڵنەوایی دەکا

commission/kəˈmɪʃn/n - v
١– پێسپاردن– ئەرک
٢– لیژنەی لێکۆڵینەوە
٣– دەڵاڵی– پارە وەرگرتن
٤– فەرمان– دەسەڵات
١– ڕادەسپێرێ ٢– پلەی... پێ دەبەخشێ
٣– ئامادە دەکا

commissionaire/kəˌmɪʃəˈneə(r)/n
دەرگەوان

commissioner/kəˈmɪʃənə(r)/n
کۆمیسیار– مەندوب

commit/kəˈmɪt/v ١– دادەنێ
٢– (تاوان) دەکا ٣– بەئەرکی خۆی دەزانێ
٤– دەیدا بە دادگا

committee/kəˈmɪti/n لیژنە

commodity/kəˈmɒdəti/n کەلوپەل

common/ˈkɒmən/n ١– هاوبەش

the common market بازاڕی
ئەورووپی هاوبەش

٢– ئاسایی– باو

common sense هەستی گشتی

the common people ڕەش و ڕووت
خەڵکی عەوام– ڕەمەکی

House of Commons ئەنجومەنی
پیرانی بەریتانی

٣– زەوی گشتی– هەموان، مەشاعەت

commonplace/ˈkɒmənpleɪs/adj
ئاسایی، بێ بەها

commonwealth/ˈkɒmənwelθ/n
کۆمن ویلس
پەیوەندی گەلانی بەریتانی

commotion/kəˈməʊʃn/n هەراوهوریا–
ئاژاوە– گێرەشێوێنی

communal/ˈkɒmjənl/adj هاوبەش–
هەرەوەزی

commune/ˈkɒmjuːn/n ژیانی هاوبەشی–
پێکەوە ژیانی وەك یەکێ لەئەرك و ماف

commune/kəˈmjuːn/v دەڕژێ لەگەڵ
هاوسۆزە– هەستە– لەگەڵ

communicate/kəˈmjuːnɪkeɪt/v

